حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عـێـراق
وەزارەتـا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# زمان و ئەدەبێ کوردی

## بۆ پۆلا دەهێ ئامادەیی

**ئامادەکرن**

لێژنەیەك ژ وەزارەتا پەروەردێ

**بژارکرن و پێداچوون و دارشتن**

شێرکۆ احمد حوێز — محمد احمد محمد — محسن احمد کریم
فیصل مصطفی حاجي — الـمـان احـمـد سلیم — وارتکیس موسیس
سگڤان جمیل محمد

**هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ**

عبدالستار فتاح حسن — عجیب عبدالله محێ — علي عبدالله صالح
ملڤان حسین سلیم

**پێداچوونا زمانی**

طە یاسین طە

چاپا چارێ — ٢٧١٥ کوردی — ٢٠١٥ زایینی — ١٤٣٦ مشەختی

# پێشدەستی

لیژنەیەك، كو ب فەرمانا وەزارەتا پەروەردەیا هەرێما كوردستانێ هاتبوو پێك ئینان، یا بەردەوامە ب بژارەكرن و پێداچوونێ و دارشتنا پەرتووكێن زمان و ئەدەبێ كوردی، یا هەردوو قوناغێن بنەرەت و ئامادەیی.

مە گرانییا كارێ خۆ د ڤێ پەرتووكێدا ئێخستە سەر هەردوو پشكێن رێزمانێ و ئەدەبێ، ئەوا ب فە ر هاتیە زانین بۆ رێكخستنا پەرتووكێ هاتە كرن.

دیارە دڤێ پەرتووكێ ژیدا هەر مە ئەو رێبازگرت یا بەری نووكە لسەر ب رێڤە دچووین، ئەوژی ئینانا نموونان ژ هەردوو زارێن سەرەكی یێن زمانێ كوردی (كرمانجیا ژووری و ژێری)، هەروەسا زاراڤێن دی ژی یێن كوردی مە ژبیرنەكرن.

پەرتووكا پۆلا دەهێ ئامادەیی بۆ چەند تەوەرەك، یا ئێكێ رێزمانە كو بابەتێن وێ ب نموونەیێن تێكەل ل بەرچاڤ بوویە، دەستوور ژی بۆ هاتە نڤیسین و راهێنان ژی بۆ هاتنە دانان، ئەڤجا هیڤیدارین ژ مامۆستایێن رێزدار كو ب گرنگیڤە بابەتان بخوینن و بۆ قوتابیان بێژن.

تەوەرێ دووێ یێ پەرتووكێ، پشكا ئەدەبێیە، كو بەحسێ رێبازا كلاسیزمە د ئەدبیاتێ كوردیدا، ب هەمی زارێن وی یێن سەرەكی، مە گەلەك نموونە ئینانە، هەر نموونەك ژی ئەو بەش دەست نیشانكریە كو بو ژبەركرنێیە، هیڤییە مامۆستایێن بەرێز پێگیریێ پێ بكەن. پشكا نموونەیێن ئەدەبی ژی، كو ژ بەحسێ چەند شاعیران پێكهاتییە، د وێ ژیدا، بزاڤ هاتییە كرن، هەمی لایەنەكێ ژیان و بەرهەمێ شاعیران روون

بکەین. د ڤێ ژێدا دیسان ئەو پارچە هاتینە دەستنیشانکرن کو بۆ ژ بەرکرنێ هاتینە تەرخانکرن. هیڤییە پێگیربن.

تەوەرێ دوماهیێ، پشکا خواندنێیە، کو پێدڤییە گرنگی ب ڤێ پشکێ بهێتە دان و پشت گوهـ نەهێتە هاڤێتن و مامۆستایێن بەرێز چەند پێ چێبیت گرنگیێ بدەنێ.

ل دوماهیێ، داخازێ ژ مامۆستایێن رێزدارێن زمانێ کوردی دکەین کو ب رێکا رێڤەبەریا گشتی یا پەروەردا پارێزگەهێن خۆ مە ب هەر کێم و کاسیەکێ ئاگەهدار بکەن دەمێ ل وانە گوتنێدا هەست پێدکەن بۆ هندێ دا د چاپا بهێتندا بهێنە راستڤەکرن، دیارە چ بەرهەم بێ کێم و کاسی نابن.

**خودێ مەزن پشتەڤانێ هەمیان بیت**
**لیژنا بژارەکرن و پێداچوون و دارشتنێ**

# ڕوونكرنەك

وەزارەتا پەروەردا حكومەتا ئێكگرتیا هەرێما كوردستانێ ب فەرمانێ وەزاری ژمارە ١٤٥٧ ل ٢٠٠٧/٢/٨ لیژنەیەك پێك ئینا بۆ ئێككرنا پەرتووكێن زمان و ئەدەبێ كوردی یێن قوناغێن بنەرەت و ئامادەیی ـ ل سەرانسەری قوتابخانە و خوێندنگەهێن هەرێما كوردستانێ.

لیژنێ دەست ب كارێ كر، هەردوو پەرتووكێن زمان و ئەدەبێ كوردی (ئیدارا جاران یا هەولێر و سلێمانیێ) كرە بنەمایێ ڤێ ئێككرنێ، و بەرچاڤگرتنەكا بهێز بۆ بابەتێن ناڤ ڤان هەردوو پەرتووكاندا و د ئەنجامدا ئەڤ پەرتووكە ژێ دەركەفت، كو پتریا پشكێن هەردوو بەشێن ڕێزمان و ئەدەبێ وێ ژلایێ لیژنەكا بەری نوكە یا دارشتن و بژارەكرنا ڤان هەردوو پشكا هاتبوو ئامادەكرن، ژبەر ڤێ چەندێ ب فەر هاتە زانین كو مافێ وانژی لسەر بیت، هەروەسا ئاماژە ب وان ژێدەر و بابەتێن گهۆڕین كەتینێ هاتە كرن كو كەتینە دناڤ پەرتووكێدا، ئەڤجا داخوازێ ژ مامۆستایێن خۆشتڤی یێن بابەتێ زمان و ئەدەبێ كوردی دكەین كو ب دلسۆزی پێگیریێ ب ناڤەڕۆكا ڤێ پەرتووكێ بكەن و هەر كێم و كاسیەكا هەبیت ب ڕێكا پەروەردەیێن خۆ ئاگەهداریا ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرامان ل وەزارەتا پەروەردێ بكەن.

هیڤیدارین خودێ مەزن هەر لایەكی سەربێخیت

**لیژنە**

٢٠١١/١٠/١٥

# بابەتێن بەشێ ڕێزمانێ

## ( ئـــامرازێ بـــانـگـــكرنـــێ )

١- ئەی شەهیدان، نامرێ ناڤ و نیشانتان.

٢- دایکێ[1]، من دەستەکێ جلکێن کوردی کڕین.

٣- خوشکینۆ، فێری زانستێ ببن.

٤- هۆشڤانێ گوندی ، پەزی ڤەگێرە.

٥- هێ بێریڤانا چیا، بزنێ بدۆشە.

## بەرچـــاڤـــکرن:

ئەگەر تەماشەی ڕستەیێن سەری بکەین دێ بینین:-

١- دڕستەیا ئێکێدا:-

ئـــ- بێـــژەیا (ئـــەی) پەیڤەکـــە گوهـــدار پـــێ هشـــیارکریە کـــو (شـــەهیدان)ن ، ژ بـــەر هنـــدی دبێـــژنێ (ئـــامرازێ بـــانگکرنێ).

ب - پـــەیڤا (شـــەهیدان) بانگکرییـــە، چـــونکە ئـــەو ناڤـــە یـــێ هاتییـــە هشیارکرن .

٢- دڕستەیا دوویێدا:-

ئـ- بێژەیا (ێ) گوهدار پێ هشیارکریە کو ناڤێ (دایك)ە.

ب- پەیڤا (دایك) پانگکرییە ، چونکە ئەو ناڤە یێ هاتییە هشیارکرن.

٣- د ڕســـتەیا ســـێیێدا:- (خۆشـــکینۆ فێـــری زانســـتێ بـــبن) ب رامانـــا (ئەی خوشکان فێری زانستێ ببن):

(١) د کرمانجییا خوارێدا : ئامرازێ (ە ) بۆ نێر و مێ و تاك و کۆ دهێتە بکارئینان (کوڕە، کچە، کوڕینە، کچینە).

ئـ- بێـژەیا (وٚ) گوهـدار پـیٚ هشـیارکریە ژ بـەر هنـدیٚ دبێـژنیٚ (ئـامرازیٚ بانگکرنیٚ).

ب- پەیڤا (خوشك) بانگكرییە، چونكە ئەو ناڤە یێ هاتییە هشیار کرن.

٤- دڕستەیا چوارێدا بێژەیا (هوٚ) پەیڤەکە گوهدار پیٚ هاتییە هشیارکرن کو(شڤانیٚ گوندی)یە ژ بەر هندیٚ دبێژنیٚ ئامرازیٚ بانگكرنیٚ.

٥- د ڕستەیا پێنجێدا:-

ئـ- بێژەیا (هیٚ) پەیڤەکە گوهدار پیٚ هاتییە هشیارکرن کو(بیریڤاناچیا) یە ژبەر هندیٚ دبێژنیٚ ئامرازیٚ بانگکرنیٚ.

ب- گرێیا(بیریڤاناچیا) بانگكرییە،چونكەئەو ناڤە یێ کو هاتییە هشیارکرن.

٦- گەر جارەکا دی تەماشەی ڕستەیێن سەری بکەین و ب هویری سەحکەینە ناڤێت بانگکری دیٚ بینین کو چێدبیت ناڤێت بانگکری:-

ئـ- تنیٚ پەیڤەك بیت وەکی د ڕستەیێن (ئێکیٚ و دوویێ و سێیێ)دا.

ب- یان گرێیەك بیت وەکی دڕستەیێن (چاریٚ و پێنجیٚ)دا.

## دەستوور:

١- ئامرازیٚ بانگكرنیٚ: ئەو ئامرازە یێ بوٚ بانگکرن و هشیارکرنا کەسیٚ گوهدار دهێتە بکارئینان.

٢- گرنگترین ئامرازێن بانگکرنیٚ ئەڤێن خوارێنە:-

(ئەی ، هەی ، هوٚ ، وٚ ، هیٚ ، یٚ ، ها ، ئا ، ئوٚ ، ئەریٚ)[1]

(١) نیشانا کوٚ (ان) یا کوٚم کرنیٚ دهێتە گوهوڕین ب نیشانا (ین) ل دەمیٚ بانگکرنیٚ (کچینە، کوڕینە).

## ڕاهێنان (١)

ئامرازێن بانگکرنێ د ڤان ڕستەیێن خوارێدا دەربینە:-

١-کوردینۆ رابن ببینن بەرخەکێ ژارو زەعیف

دانە بەر پال و کێشانا خەنجەرەك دژوار ل دیف

((بدرخان سندی))

٢- نەسرین ئەی ئەستێرەی بەیان،

ئەی جوان، ئەی شادەستەی جوانان

٣- هۆ برازا وەرە ڤێرە.

٤- ئەرێ قوتابی تە وانە خواندییە؟

## ڕاهێنان ( ٢ )

ڤان ڤالاییێن خوارێ ب ڤان ئامرازێن بانگکرنێ پڕبکە:-

(هۆ ، ۆ ، ئەی ، دێ ، ە )

١- ............... مانگ، من و تۆ هەردوو هاودەردین.

٢- ............... دابچین بۆ تەماشەی یارییێ.

٣- پوور ............... ، نانەکەت بخۆ.

٤- کوڕ ............... ل خۆ هشیاربە.

٥- ............... سەرباز د خزمەتا وەلاتییدا بە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

د ڤان دێره هوزان و ڕستەیێن خوارێدا بانگ لێكرییان دەربینه و جورێ وان دیاربكه:-

١- ژ خامێره من گوتی: ئەی خامه كیژ

لسەر روویێ كاغەز بفێرین و قیژ

٢- خەلكه من بۆ خوا، وا پێتان ئەلێم

ئەمه وەسیەته، وا من له سەر رێم

٣- ئەی دەروێشێ نەزان دزێ ژینا كوردان

دەرمانێ نەزانا تەنێ زانم چویه

٤- دێ ئاری وێ گوڤارێ بۆ من بینه.

٥- خوشكێ ژ ئاخفتنا دەیكا خۆ، دەرنەكەڤه.

## ( ئامرازێ لێکدەر )

١- ئاشتی و دوستایەتی، ئارمانج و هیڤیا گەلانە.

٢- نە لە شارو و نە لەدێ نەم دی کەس وەك تۆ جوان بێ.

٣-بەعسییێن فاشێست بـاژێرك و گوند و مزگەفت و خویندنگەهـ و نەخوشخانەییێت کوردستانێ کاڤلکربوون.

٤- شێروان نەهاتە کۆمبوونێ، چونکە یێ نەخۆشبوو.

٥- ئاخفتنەکا باش بێژە یان بێ دەنگ ببە.

**بەرچاڤکرن:**

زۆر جار د ئاخفتن و نڤیسنێدا، ژبەر رەوانبێژی یان ژبەر ساناهیێ یان وێ چەندێ ڕستە نەهێتە دووبارەکرن" دوو پەیڤ یان دوو گرێ یان دوو ڕستە ب هاریکاریا ئامرازەکی ددەینە دگەل ئێك، ئەو ئامرازێن ڤێ ئەرکی دبینن دبێژنێ: ( ئامرازێ لێکدەر ).

د ڕستەیا ئێکێدا، ل جهێ کو ب چەند ڕستەکێن جودا جودا بێژین :

ئاشتی و دوستایەتی هیڤیا گەلانە.

دوستایەتی، هیڤیا گەلانە.

ئاشتی، ئارمانج و هیڤیا گەلانە.

ژ لایەکی ڤە، پەیڤا (ئاشتی)، (دوستایەتی) ژ لایەکێ دیڤە پەیڤا (ئارمانج)، (هیڤیا گەلان) ب هاریکاریا ئامرازێ لێکدەر (و) مە داینە پالێ هەڤ.

د هۆزانا گورانیدا (نەلە شارو نەلە دێ نەم دی کەس وەك تۆ جوان بێ) گرێیا (نە شار) ب هاریکاریا ئامرازێ لێکدەر (و) مە داینە پالێ ئێك.

ئەرکێ وان پەیڤا یان گرێیێت کو ب ڤی شێوەی ددەینە پالێ ئێك یان گرێیا بەری وێ، پێکڤە ئەرکەك هەیە ژ ئەرکێن پەیڤێ بۆ نموونە:

د ڕستەیا ئێکێدا ( ئاشتی و دوستایەتی ) گرێیەکا ناڤییە و نیهادێ ڕستێ یە.

د ڕستەیا دوویێدا (نە لە شار) (نە لە دێ) هەردوو گرێیت هاولکارینە و هەردوو تامکەرێن کارینە.

د ڕستەیا سێیێدا (بازێر و بازێرك و گوند و مزگەفت و خویندنگەه و نەخوشخانە) گرێیەکا ناڤییە وبەرکارە.

ڕستەیا چوارێ و پێنجێ هەر ئێك ژ دوو ڕستەیێن سادە پێك هاتینە و ب هاریکاریا ئامرازێ لێکدەر (چونکە) و (یان) کەفتینە پالێ ئێك.

**دەستـوور:**

ئامرازێ لێكدەر ئەو بێژەیە یا دوو پەیڤان یان دوو گرێیان یان دوو ڕستەیان پێكڤە گرێددەت، هەر ئێك ژوان بۆ گەلەك مەبەستێن جیاواز دهێتە بكارئینان.

ئامرازێن لێكدەر دزمانێ كوردیدا زۆرن ژوان:

(كو ، و ، تا ، یان ، لێ ، یانژی ، ژبلی ، دگەل ، نەك ، نە ، نەوەك ، ئەگەر ، مەگەر ، پاشی ، پشتی هینگێ ٠٠٠ هتد).

## ڕاهێنان (١)

ڤان ڤالاییێن خوارێ ب ئامرازەكێ لێكدەرێ گونجای پربكە:-

١- خوشك .............. برایێ وێ پەز ل بنارێ چیای دچەراند.

٢- بەستی .............. بهێتە گەرمكرن، جارەكا دی دبیتە ئاڤ.

٣- ئەز ژ مێژە نالڤم .............. ئەو نەهێن.

٤- ئەو یێ لناڤ كارێ خۆ .............. هوین هێشتا یێ ل مال.

٥- ئازاد و نەوزاد .............. هەمی هەڤالان هاتن.

٦- .............. زارۆ دگری دایكا وی شیر بۆ بەرهەڤدكر.

٧- .............. وان قوتابییان تۆ وەرە.

## ڕاهێنان (٢)

د ڕستەیێن خوارێدا ئامرازێ لێکدەر دەربینە:-

١- پیرەمێرد دبێژە:

لە دەربەندیخان هەتا کەلیخان

ئەو ناوە یەکسەر شێواوە و وێران

شێوو هەردو بەرد تا لوتکەی بەرزان

پر لە وەیشوومە، بە گەلاّ ڕێزان

٢- گەر زڤستانێ بەفرو باران نەباریت ئاڤا بەنداڤا کێم دبیت.

٣- کارزان دگەل هەڤالێن خوٚ زوٚر بزاڤێ دکەت، چونکە دترسیت کو د ئەزموونان دا دەر نەچیت.

٤- بێکەس دبێژیت:

ئەمروٚ زەمانێ عیلم و عیرفانە

عالەم شەو روٚژ والە فرمانە

فەرقی نێر و مێ نییە بیزانە

هەستە تێکوشە تا خوێنت گەرمە

سەرپوٚش فڕێدە چ وادەی شەرمە

## ڕاهێنان (٣)

ب هاریکاریا ئامرازێ لێکدەر سێ گرێیان دروستبکە و دڕستەیاندا بکاربینە ب مەرجەکی ببنە:-

١- بکەر ٢- بەرکار ٣- تەمامکەرێ بەیاریدە.

## ڕاهێنان (٤)

د ڤان ڕستەیێن خوارێدا ئامرازێ پەیوەندی، لێکدەر، بانگکرنێ ژێك جودا بکە:-

١- کوردینۆ ئێك بگرن.

٢- کە زۆر هات، قەوالە بەتاڵە.

٣- ئاسۆ و نەبەز، پشتی مە گەهشتنە هەولێرێ.

٤- ئەی خویندکارێ ژیر، د وانەیێن خۆدا خەباتێ بکە.

٥- دایك و باب بۆ سەرفەرازیێ کاردکەن.

## ڕاهێنان ( ٥ )

ڤان ڕستەیان شرۆڤەبکە:-

١- کاوە گەهشتە ماڵ، پاشی نان خوار.

٢- بەپەلە هاتم، کەچی ئاری ڕۆیشتبوو.

# ( جێناڤێ لێکدەر (کە ، کو))

ڤان ڕستەیان بخوینە:

١- ئەو خورتێن کو ژ بۆ مللەتی دخەبتن، سەرفرازن.

٢- ئەو ماموستایێ کو پێشمەرگە بوو، هاتە شەهیدکرن.

٣- ئەڤ کچا کو دچیتە قوتابخانێ، هیڤیا گەلی یە.

٤- ئەو کتێبا کو لسەر مێزێیە، یا منە.

٥- ئەڤ بازێرێ کو جادەیێن وێ زۆرن، یێ جوانە.

٦- کوردایەتی کو ئەڤینەکا گەورە و ب هێزە، ڕامانا بەرگرییێیە ژ خاك و نەتەوەیێ کورد.

٧- ڕەواندوز کە پایتەختی میرنشینی سۆران بوو، شارێکی خۆش و دلگیرە.

## بەرچاڤکرن:

ڕستەیێن سەری، هەر ئێك ژ دوو ڕستەیێن سادە یان پتر پێکهاتییە، لێ ڕستە لێکداینە و بووینە ئێك ڕستە، ئەو لێکدان ژی ب هاریکاریا پەیڤەکێ یە دبێژنێ (جێناڤێ لێکدەر)، جێناڤێ لێکدەرژی یان (کو) یان (کە) یە.جێناڤە، چونکە د هەر ڕستەیەکێدا ژ وان ڕستەیان جهێ ناڤێ کەسەکی یان تشتەکی گرتییە لێکدەرە، چونکە دوو ڕستە یان پتر پێکڤە گرێدداینە و بەهرا پتر ژی دکەڤیتە پشتی وی ناڤی ئەوێ جهێ وی دگریت د ڕستەیا دوویێدا. جێناڤێ لێکدەر ژبلی کارێ لێکدانێ هیچ ئەرکەکێ دی وەرناگریت.

١- د ڕستەیا ئێکێدا، کو ڕستەیەکا لێکدایە وبەری هینگێ دوو ڕستە بوویە هەر ئێك ڕستەیەکا سادە بوویە:

ئـ- ئەو خورت سەرفرازن.

ب- ئەو خورت ژبۆ مللەتی دخەبتن.

هەر ئێك ژ ڤان ڕستەیێن سادە، ژ کارەکی و ڕەگەزێن سەرەکی یێن ڕستەیێ پێکهاتییە، لێ دەمێ مەداینە پالێ هەڤ ژ بۆ دروستکرنا ڕستەیەکا لێکدای، ئەم هاتین ل جهێ گرێیا (ئەو خورت) کو گرێیەکا ناڤی یە دڕستەیا دوویێدا پەیڤا لێکدەر (کو) مە دانا چونکو جێناڤەکێ لێکدەرە.

٢- د ڕستەیا دوویێدا کو پێشتر ژ دوو ڕستەیێن سادە پێکهاتبوو:-

ئـ- ئەو ماموّستا هاتە شەهیدکرن.

ب- *ئەو ماموّستا پێشمەرگە بوو.*

د هەر ئێك ژ وان ڕستەیاندا پەیڤێت (ئەو ماموّستا) هاتییە بکارئینان، دڕستەیا ئێکێدا ئەرکێ جێگرێ بکەری دیتییە و دیا دوویێدا ئەرکێ نیهادی دیتییە، لێ مە جێناڤێ لێکدەر (کو) بکارئینایە دا کو هەردوو ڕستەیان پێکڤە گرێدەت.

٣- هەر ب ڤی ڕەنگی، د ڕستەیا سێیێ ژیدا کو ژ دوو ڕستەیێن سادە پێکهاتییە:-

ئـ- ئەڤ کچە هیڤیا گەلییە.

ب- ئەڤ کچە دچیتە قوتابخانێ. پێکهاتییە ، دەستە پەیڤا (ئەڤ کچە) مە لا دایە و ل جهێ وێ (کو) بکارئینایە کو جێناڤەکێ لێکدەرە.

٤- د ڕستەیا چوارێدا کو ڕستەیەکا لێکدایە و بەری هینگی ژ دوو ڕستەیێن سادە پێکهاتیبوو:-

ئ- ئەو کتێب یا منە.

ب- کتێب لسەر مێزێیە.

د هەر ئێك ژ ڤان ڕستەیاندا پەیڤا (کتێب)ئەرکێ نیهادی دیتییە، لێ دەمێ مە دگەل ئێك بکارئینانە. دڕستەیا دوویێدا ل جهێ دووبارەکرنا پەیڤا (کتێب)، جێناڤێ لێکدەر (کو) هاتییە بکارئینان.

٥- د ڕستەیا پێنجێدا کو ڕستەیەکا لێکدایە و پێشتر دوو ڕستەیێن سادە بووینە:-

ئ- ئەڤ باژێرە یێ جوانە.

ب- ئەڤ باژێرە جادەیێن وێ زۆرن.

هەر ئێك ژ ڤان ڕستەیێن سادە ژ نیهاد و کارەکێ ناتەواو و تامکەرەکی پێك هاتییە، لێ دەمێ مە دگەل ئێك بکارئیناین، ژبۆ دروستکرنا ڕستەیەکا لێکدای ، مە ل جهێ دەستە پەیڤا (ئەڤ باژێرە) دڕستەیا دوویێدا جێناڤێ (کو) بکارئینا کو جێناڤەکێ لێکدەرە.

٦- د ڕستەیا شەشێدا هەر ب وی ئاوایی دڕستەیا دوویێدا ل جهێ پەیڤا (کوردایەتی) جێناڤێ (کو) هاتییە بکارئینان.

٧- دڕستەیا حەفتێدا ل جهێ دووبارەکرنا پەیڤا (رەواندوز) جێناڤێ (کە) هاتییە بکارئینان.

**دەستوور:**

١- جێناڤێ لێکدەر ئەو پەیڤە کو ل جهێ ناڤێ کەسەکی یان تشتەکی دهێتە بکارئینان کو پێشتر یێ هاتییە باسکرن، هەروەسا دوو ڕستە یان پێکڤە گرێددەت، و ڕستەیەکا لێکدای ڕێك دئێخیت.

٢- جێناڤێن لێکدەر (کو ، کە) نە.

٣- جێناڤێ لێکدەر بەهرا پتر دکەڤیتە پشتی وی ناڤێ کو د ڕستەیا دوویدا جهێ وی گرتییە.

## ڕاهێنان (١)

ژڤان ڕستەیێن لێکدای هەردوو ڕستەیێن سادە ژێك جودا بکە:-

١- ئەو کەسێ کو زارۆکێن خۆ باش پەروەردەکەت،نیشتمان پەروەرە.

٢- ئەو رەزێ کو تە کێلای یێ بابێ منە.

٣-مامۆستایان کە رەنجی فێرکردن پێشکەش بەهاونیشتمانیان دکەن پێشەوای گەلن.

٤- ئەڤ پارێ کو تو بەلاڤ دکەی ، سامانێ مللەتییە.

٥- ئەڤ ئازادیا هوون دبینن ، بەرهەمێ قوربانیدانێیە.

٦- کوردستانی عیراق کە بەخوێنی شەهیدان ئازادکرا، پێشکەوتووە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەڤان ڕستەیان شرۆڤەبکە:-

١- ئەو قوتابیێ کو مە دوهی دیتی، خارزاییێ تەیە.

٢- ئەو گەلەی کە بەئازادی بژیت، سەرفەرازە.

# ڕستەیا ئاوێتە ( لێكدای )

ڤان ڕستەیان بخوینە:-

١- ئەو هوزانێن کو تە ژبەرکرین، گەلەك دخوٚشن.

٢- کەرکووك کو دمێژوویێدا ب ( ئارابخا ) ناڤدارە، شارەکێ کوردستانێیە.

٣- تە نە بهیستییە کو دلوڤانی خویندنا خـوٚ تمامکرییە.

٤- نەت زانیوە کە چیـروٚکێ مەم و زین بەشاکاری خانی دادەنریٚ؟

٥- تو نزانی کو هێز د ئێکگرتنێدایە.

## بەرچـاڤـکـرن:

هـەر ئێـك ژ ڤـان ڕسـتەیێن سـەری د بنیاتـدا ژ دوو ڕسـتەیێن سـادە و سـەربخوٚ پێکهاتییـە پاشـی ب هاریکاریا جێنـاڤ یـان ئـامرازێ (کـو ، کـە) هاتینـە لێکـدان و بوویـە ڕسـتەیەکا (لێکـدای).دڕسـتەیا لێکدایـدا ڕسـتەکا سادە یا سـەرەکی و سـەربخوٚ ژ لایـێ واتـایێ ڤـە کـو دبێـژنێ (شاڕسـتە)، لیٚ ڕستەیەکا دی ژی تێدایە سا سەربخوٚنییە ژ لایێ واتایێ ڤە، بـەلکو سـەرب شارستێڤە یـە، ئـامراز یـان جێنـاڤێ لێکـدەر دکەفتـە پێشـیا وێ" دبێـژنێ: (پاڕستە).

بـوٚ نموونـە د ڕسـتەیا ئێکێدا کـو ڕسـتەیەکا لێکدایـە (ئـەو هـوزان گەلـەك دخوٚشـن) شاڕسـتەیە لیٚ (کـو تـە ژبـەرکرین) ڕسـتەیەکا سـەربخوٚنینە بـەلکو سەرب شارستێڤە یە دیارە جێهناڤێ لێکـدەر (کـو) کـەفتی یـە پێشـی" لـەو دشـێین ب سـاناهی (پاڕسـتە) یـێ ژ (شاڕسـتە)یـێ جـودا بکـەین، دیـارە چ پاڕستە یـان شاڕسـتە هـەر ئێکـێ ژوان (کـار) یٚ خـوٚ هەیـە، ب ڤـێ چـەندێ ڕستەیا لێکدای چەند کارتێدا هەبن هند ڕستەیێن تێدا هەین.

## دەستوور:

١- ڕستەیا لێکدای ژ دوو ڕستەیێن سادە یان پتر پێك دهێت ب هاریکاریا پەیڤا لێکدەر: جێناڤ یان ئامرازێ ( کو ، کە ) پێکڤە دهێنە لێکدان.

٢- د ڕستەیا لێکدایدا ئەو بەشێ سەرەکی و سەربخۆیە دبێژنێ ( شارستە ) لێ ئەو پشکا کو سەربخۆنینە ڕامانا وێ گرێدایی ڕامانا شارستێ یە دبێژنێ ( پاڕستە ).

٣- پەیڤا لێکدەر دڕستەیا لێکدایدا هەردەم دکەڤیتە پێش ( پاڕستە ) یێ لەو ب ساناهی دشێین دڕستەیا لێکدایدا شارستێ ژ پارستێ جودا بکەین.

٤- ژمارا کارێن ڕستەیا لێکدای، ژمارا پشکێن وێ دەردئێخن، واتە دڕستەیا لێکدایدا چەند ( کار ) هەبن هند بەشە ڕستە ژی دێ هەبن.

٥- پەیڤا لێکدەر دبیتە جێناڤێ لێکدەر گەر ل جهێ ناڤەکی یان جێناڤەکی هات وەکی: ئەڤ کتێبا کو لسەر مێزێ یە یا هەڤالێ منە.

لێ ئەگەر تنێ دوو ڕستەیان پێکڤە گرێبدەت وی دەمی دبیتە ئامرازێ لێکدەر، چونکە جهێ هیچ ناڤەکی ناگریت وەك:

نەت بیستووە کە هەولێر پایتەختی کوردستانی عیراقە.

## ڕاهێنان (١)

ئەڤان د ڕستەیێن لێکدایدا بکاربینە:-

١- کو هوزانڤانەکێ مەزنبوو.

٢- کە کوردستان ئاوەدان دەکەنەوە.

٣- کو تە فرۆشتی.

٤- کو تە دیتییە.

٥- کو سالار ب دویف زانستێ دگەڕیێت.

٦- کو حکومەتا هەرێما کوردستانێ پرۆژێن مەزن ڤەدکەت.

٧- کە گوندێکی خۆش بوو.

## ڕاهێنان (٢)

پەیڤا ( کو ) و ( کە ) هەر ئێك ژ وان د دوو ڕستەیاندا بکاربینە ب مەرجەکی جارەکێ جێناڤێ لێکدەربن و جارەکێ ژی ئامرازێ لێکدەربن.

## ڕاهێنان (٣)

ڤان ڤالاهییان ب ڕەنگەکی پڕبکە کو ڕستەیەکا لێکدای ژێ پێك بهێت:-

١- من بهیستییە، ..............

٢- ئەم دزانین، ..................

٣- گوران ................ لە هەلبچە لە دایك بووە.

٤- هەلەبجە کو ............... شارەکێ مەزنێ کوردستانێیە.

٥- ئەوێ کو نیشتمان پەروەربیت ...............

## ڕاهێنان (٤)

ڤان ڕستەیا شرۆڤەبکە:-

١- ئەو قـوتابیێ کو دوهی هاتی، سەرکەفتییێ ئێکێ بوو.

٢- ئەو کوردێ کو خەبات کری، جهێ ڕێزگرتنێیە.

# دروستکرنا ناڤێ واتایـی

١- هۆ کـاکـی بـرا کـاکی کـورد
وەرە تـوزێ گـویـێ پـیاوەتـی

لـە هەر کویێ هەی شەنی یـاگرد
شل کـــە بۆ لای کـــوردایـــەتی

(کامل ژیـر)

٢- جــاران پــەناگایی شــەوانم
گـەرمی و نەرمی ئەو ئــامێزە

ئـــامـێزی ئـــاوەلای ژن بـــوو
مایەی حەســـانەوەی من بـــوو

(هێمن)

٣- کوشتم تە ب داخا دوو چـاڤـــا
تیـر کـو بـــەردابوو هـنـاڤـــا
نەشیـــام ئەز پاڤێم دوو گـاڤا
ژکویری و ســـاریـــا بــریـنـێ

(تاهر روشدی)

٤- هەر لەزاخۆ هەتـا کرماشان
لە مـەهاباد هەتا سلێمانی

پرسەیە ، ماتەمە، بەخـــۆ دادان
نـالـە نالە لـــە بــاتی گـــورانی

(گـــوران)

٥- کوردینی یامە ئاگرەکە هەر هەلە
ئــاگـــردانە دلـــێ مە تژی پەلـە

(بەدرخان سندی)

٦- مخابن بۆ جـــهێ كـــوردان
نهو لـــێ بـــوویه ئیڤـــاری
هەتا ئەڤرو دخەودامـــان
بسەردا هـات شەڤا تـاری

(ئەحمەدێ نالبەند)

## بەرچـــاڤـــكـــرن:

د پرۆگرامـــێ ســـالێن بۆریـــدا، و دبابـــەتێ دابەشـــكرنا نـــاڤی ژ لایـــێ هەبوونێڤە، مەزانی كو ناڤێ واتایی دوو جۆرە، جۆرێ ئێكێ ئەو ناڤن یێن دبنیاتدا ناڤێن واتایینە وەكی:

شـــەرم، ژیـــر، هـــۆش، هێـــز • جـــۆری دوویـــێ ئـــەو نـــاڤێن واتایینـــە كـــو دەستكرد و دروستكرینە و ئەڤ دروستكرنە ژی لپەی یاسا و بنەمایێن تایبەتی پێك دێت، لەوما ژبۆ روونكرنا چەوانییا دروستكرنا ناڤێ واتایی، ئەگەر تەماشەی نموونان بكەین دێ بینین:-

١- د هـــەردوو مـــالكێن هوزانـــا ئێكێـــدا، دوو نـــاڤێن واتـــایێن دروســـتكری هەنـــە، (پیـــاوەتی)، (كوردایـــەتی)، ڤـــان دوو ناڤـــان بوونـــەكا ســـەربخۆ نینـــە تنـــێ د هـــزو بیـــراندا هەســـت پـــێ دهێتـــە كـــرن، یـــا ئێكـــێ ژ نـــاڤێ (پیـــاو) و پاشـــگرێ (ە تـــی) و یـــا دوویـــێ ژ نـــاڤێ (كـــورد) و پاشـــگرێ (ایەتی) هاتینە دروستكرن.

٢- د هـــەردوو مـــالكێن هوزانـــا ژمـــارە (٢) دا و مـــالكێن هوزانـــا ژمـــارە (٣) ناڤێن واتایی (گـــەرمی)، (نـــەرمی)، (كـــویری)،(ســـاری) بەرچـــاڤ دكـــەڤن، ئـــەڤ چـــوار ناڤـــە ژی ژ (هـــەڤاڵناڤ) ی و پاشـــگرێ (ی) هاتینـــە دروستكرن.

٣- ئەگەر مالکێن هوزانێن ژمارە (٤) بخوینین، دێ بینین هەردوو ناڤێن واتایی (پرسە)، (ناڵە) ب ئێك یاسا هاتینە دروستکرن، ئەو ژی پێکهاتییە ژ رەگێ کاری دگەل پاشگرێ (ە)، چونکە (پرسە) ژ رەگێ کارێ چاوکێ (پرسین) و (ناڵە) ژی ژ رەگێ کارێ چاوکێ (ناڵین) دگەل پاشگرێ (ە) هاتینە دروستکرن.

٤- هەر وەسا دمالکێن هوزانا ژمارە (٥)دا ناڤێن واتایی یێن دروستکری (کوردینی) بەرچاڤ دکەڤیت و ژ ناڤێ (کورد) دگەل پاشگرێ (ایەتی) دروست بوویە.

٥- هەروەسا د مالکێن هوزانا ژمارە (٦) دا ژی ، ناڤێ واتایی (خەو) بەرچاڤ دکەڤیت، کو رەگێ کارێ چاوکێ (خەوتن)ە وئەو بخو بوویە ناڤێ واتایی.

## دەستوور:

ناڤێ واتایی، ناڤەکە ئەوێ ب خو هەبوونەکا سەربەخو نینە، بەلکو د هزر و خەیالێدا پەیدا دبیت ئەڤ جورە ناڤە ژی دبیتە دوو جور:-

ئ- ناڤێ واتایی بنجی: کو ئەو ب خو دبنیاتدا ناڤەکێ واتایی یە.

ب- ناڤێ واتایی دەستکرد ( دروستکری ): ب ڤان رێکان دهێنە دروستکرن:-

١- ناڤ دگەل پاشگرەکی، بەهرا پتر ژی پاشگرێن دهێنە بکارئینان ئەڤەنە :

( ی ، ە تی ، یە تی ، ا یە تی ، یێن ، ینی ، ا تی ، یی ).

٢- هەڤالناڤ دگەل پاشگرەکی: پاشگر ژی بەهرا پتر ئەڤەنە :

( ی ، یە تی ، یێتی ، ا یی ، ە ، ا تی ، ا ).

ئەڤ پاشگرە دهێتە زێدەکرن ل سەر:-

ئـ- هەڤاڵناڤێ چەوایيی، وەك : ڕەشی، باشـی، بلندی٠ ٠ ٠ .

ب - هەڤاڵناڤێ بکەرێ دارێژتی، وەك: سەرپەرشتياری، دانايی، زانايی ...

ج - هەڤاڵناڤێ بکەرێ لێکدايی، وەك گەشبينی، ڕەشبينی، گيا نيازی ...

٣- ڕەگێ کاری دگەل پاشگرێ (ە) وەك: پرسە، تەقە،...

٤- جار ژی هەيە ڕەگێ کاری ب خۆ دبيتە ناڤێ واتايی: خەو، جەنگ، ڕەنج.

٥- قەدێ چاوکی گەل پاشگرێ (ا ر) وەك: کريار، مرار، بريار.

٦- هـــەمی چـــاوك وەك نـــاڤێ واتـــايی بکـــاردهێن: هاتـــن، چـــوون، کڕين، مـان، خويندن ...

* وەکـی هـەر ناڤـەکێ دی دبيتـە (نيهـاد ، بکـەر ، بـەرکار ، تمامکـەر يـان (ديارخەر) یێ ناڤی، تمامکەرێ بەياريدە، تمامکەرێ کارێ ناتەواو).

## ڕاهێنـان (١)

د ڤان دێرە هوزانانـدا نـاڤێن واتـايی يێن دروسـتکری دەستنيشـان بکـە و جۆرێ دروستکرنا وان بێژە:-

١-لێ هيڤی دکەم ژ موستەعـيدان
حەرفان نەگرن ژ موستەفـيدان
ئەڤ نامە ئەگەر خرابە گەر قـەنج
کێشايە مە دگەل وێ دوو سەد رەنج

٢- جوامێری و هيمەت و سەخاوەت
مێرينی و غيـرەت و جەلادەت
ئـەو خـەتمە ژبۆ قەبيلی ئەکراد
وان دانە ب شيـر و هيمەت و داد

## ڕاهێنان (٢)

یاسا دروستکرنا ڤان ناڤێن واتایێن دروستکری بنڤیسه:

(خوشەویستی ، کرێتی ، کوخه ، برساتی ، تەقه ، دوستینی، مروڤایەتی ، کورینی ، گەرما).

## ڕاهێنان (٣)

بەرسڤا ڤان پرسیاران بده:

١- جوداهی دناڤبەرا ناڤێ بەرجەسته و واتایی دا چییه؟

٢- پێنج چاوگێن دەنگی بینه و ناڤێ واتایی ژێ دروستبکه.

## ڕاهێنان (٤)

دڤان ڕستەیاندا، ئەو پەیڤێن هێل ل بن کێشای شروڤەبکه:-

١- زانایی سەرەکانیا بەختەوەرییێ یه.

٢- کار به ناڵه و گریه چارەسەر ناکرێت.

٣- ڤێ دوزێ ئارامی پێ دڤێت.

٤- ئاخفتنا زور بو مروڤێ کرێتییه.

# هەڤالناڤێ ژمارەیی

## ١- هەڤالناڤێ ژمارەیی بنجی

ئەڤان نموونەیان بخوینە:

١- دلبەرێ ئیرۆ سەحەر ئاڤێتە جەرگێ من دوو دۆخ
یەك ل سینە یەك ل دلدا لەو ژمن تێن ئاخ و ئۆخ

( مەلایی جزیری )

٢- بیست و حەوت سالە من رەنجبەری تۆم
بەنان و ئاوو جل و بەرگی خۆم
خزمەتم کردی لە ئێران و رۆم

( بێکەس )

٣- پتر ژ پێنج سەد کەسان ل ئاهەنگێ ئامادەبوون.

٤- ئەڤ سالە چل خویندکار دەرچوون.

٥- هزار پەرتووك د پەرتووکخانا خویندنگەها مەدا هەنە.

٦- سێ چوار قوتابی د پۆلا مەدا زیرەکن.

## بەرچاڤکرن:

ئەگەر ئەڤان نموونەیان بخوینین دێ بینین:

١- د نموونەیا ئێکێدا هەڤاڵناڤێن ژمارەیی (دوو) و (یەك) کو هەر ئێك ژوان ئێخستییە بەری ناڤەکی، بۆ هندێ پەسنا وی ناڤێ پێ بهێتە کرن و دەستنیشانا هژمارا وان (دۆخان) پێ بێهتە کرن کو ل سنگ و دلێن وان دایە، واتە سنوورەك بۆ ژمارەیا وی ناڤی هاتییە دانان، ئەڤ هەڤاڵناڤە بێ هاریکاری ل پێش ناڤی هاتییە دانان.

٢- د نموونەیا دوویێدا ژی هەڤاڵناڤێ ژمارەیی (بیست و حەوت) کو هەڤاڵناڤەکێ لێکدایە ژ دوو هەڤاڵناڤێن ژمارەیی سادە دروست بوویە، یێ ئێکێ (بیست) و یێ دوویێ (حەوت)، ئەڤ دوو هەڤاڵناڤە ژی ب ئامرازێ (و) هاتینە لێکدان و ل پێش ناڤێ (ساڵ) هاتییە دانان بۆ هندێ دا پەسنا وی ناڤی پێبکەین و سنوورەك بۆ هژمارا ساڵان بهێتە دانان، ئەڤ هەڤاڵناڤە ژی بێ هاریکاری ل پێش ناڤی هاتییە دانان.

٣- د ڕستەیا سێییێدا هەڤاڵناڤێ ژمارەیی (پێنج سەد) کو هەڤاڵناڤەکێ لێکدایە ژ دوو هەڤاڵناڤێن ژمارەیی سادە دروست بوویە، یێ ئێکێ (پێنج) و یێ دوویێ (سەد)، بێ هاریکاری هاتینە لێکدان و سنوورەك بۆ هژمارا کەسان بهێتە دانان، ئەڤ هەڤاڵناڤە ژی بێ هاریکاری ل پێش ناڤی هاتییە دانان.

٤- د ڕستەیا چوارێدا هەڤاڵناڤێ (چل) بێ هاریکاری ل پێش ناڤێ (خویندکار) هاتییە دانان دا هژمارا خویندکاران دەستنیشان بکەت و پەسنا وی ناڤی ژی پێ بهێتە کرن.

٥- د ڕستەیا پێنجێیدا هەڤاڵناڤێ (هزار) بێ هاریکاری ل پێش ناڤێ (پەرتووك) هاتییە دانان دا هژمارا پەرتووکان دەستنیشان بکەت و پەسنا وی ناڤی پێ بهێتەکرن.

٦- د ڕستەیا شەشێدا هەڤاڵناڤێ (سێ چوار) ل پێش ناڤێ قوتابی هاتییە دانان و بێ هاریکاری، پەسنا ناڤێ پێهاتییەکرن و سنوورەك دانایە بۆ ژمارا قوتابییان، لێ ژبەرکو گومان دهژمارێدا هەیە ژبەر هندێ هیچ ئامرازك دناڤبەرا واندا نەهاتییە دانان.

**دەستوور:**

هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ بنجی، هەڤاڵناڤەکە ناڤێ پشتی خۆ (تمامکرییێ وی) ب هژمار دەستنیشان دکەت وسنوورەکی بۆ هژمارا وی دادنیت.

١- ئەو ناڤێ لدویڤ هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ بنجی دهێت، سادە بیت یان نە سادە بیت، دڤێت تاك بیت، بەلێ دەمێ دبێژین (ب شەش ڕۆژان من کارێ خۆ تمامکر)، (شەش ڕۆژان) دێ بیتە گرییەکا هەڤاڵکاری.

٢- هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ بنجی بێ هاریکارییا ئامرازێ دانەپال (ی) دئێخینە بەری ناڤێ تمامکری، بەلێ ئەگەر ئامرازێ دانەپالێ (ی) بێخینە دناڤبەرا واندا وی دەمی هەردوو پێکڤە دێ بنە گرێیا هەڤالکارییا کاتی وەك:

شۆرەشا کوردی ل یازدەی ئەیلوولێ سەرهلدا.

لڤێرەدا (یازدەی ئەیلوول) گرێیەکا هەڤاڵکارییە، ئەڤ شێوەیە پتر دگەل هەیڤان بکاردهێت.

٣- ئەگەر دوو ژمارە لدویڤ ئێك هاتن و گومان د ژمارەییێدا هەبوو، ئامرازێ (و) دناڤبەرا واندا ناهێتە دانان وەك:

من پێنج شەش سێڤ خوارن. دڤێرێدا وێ ژمارەیێ گومان تێدا هەیە چونکی دبیت پتر یان کێمتربن ژ (پێنج، شەش)

٤- هەڤاڵناڤێن ژمارەییێن بنجی (هەشت، نەه، دەه) پێکڤە دهێن و بێ ئامراز. بۆ نموونە (هەشت نەه دەه زەلاٛم هاتن)(هەشت نۆ دە پیاو هاتن).

٥- ژ ژمارە (بیست) و سەردا ئەگەر گومان د ژمارەییێدا هەبیت سەرەگرێ دهێنە گوتن وەك:

بیست سیه کەس هاتن.

حەفتێ حەشتێ قوتابی دەرچوون.

٦- ژمارە (دەه) و دەه جارییێن وێ (سەد - هزار ... هتد) دشیاندایە نیشانەیا کۆ (ان) دانینە سەر و بێژین:

سەدان پێشمەرگە هاتنە شەهیدکرن.

ب هزاران کورد هاتنە کیمیا باران کرن.

٧- هەر دەمەکێ مەبڤێت (بڕ)ا تشتەکی دەستنیشان بکەین دێ پەیڤەکێ ئێنین کو وێ (بر) ێ دەستنیشان بکەت و لپەی ژمارەیێ دێ بکارئینین وناڤێ هژمارێ دێ پێ کەینە ناڤەکێ لێکدای وەك:

من سێ کیلۆیێن شەکرێ کڕین.

زەڤیا مە شەش جوهال گەنم ژێ هاتن.

ئەڤ پەیڤێن ل خوارێ بۆ ڤان مەبەستان بکاردهێن، بۆ نموونە:

ئ- نەفەر ←——— بۆ مرۆڤان: شێست نەفەر د فروکێدا بوون.

ب- سەر ←——— بۆ تەرش و تەوالی: من شەش سەرێن بزنان هەنە.

پ- دەست ←——— بۆ جلك و نڤینا: وێ دوو دەستێن جلکان شویشتن.

ت- بەرگ ←——— بۆ پەرتووکان: وی سێ بەرگێن پەرتووکێن رێزمانێ کڕین.

ج- چاڤگ - چاوە ←——— بۆ (ژوور - برکا ئاڤێ): برکا ئاڤێ سێ چاڤکێن هەین.

چ- پارچە ←——— بۆ زەڤیان: سەد پارچە زەڤی ب سەر مامۆستایاندا دابەشکرن.

ح- بن - بنە ←——— بۆ دار و باران: من چوار بنێن دارا چاندن.

خ- دانە - کت ←——— بۆ تشتی دهێتە هژمارتن: من دوو دانەپێنووس هەنە.

د- جووت ←——— بۆ پێلاڤ و گۆرا: کاوەی دوو جوتێن پێلاڤا کڕین.

٨- پەیڤا (هندە - ئەوەند) هەڤالناڤێ ژمارەیێ نادیارە ژ سێیێ تا نەهێ دگەهینیت وەك:

بیست و هندە سالە من تو نەدیتی.

پەنجاو ئەوەندە سالە بێکەسی شاعیر کۆچی دوایی کردووە.

٩- ژمارەیا بنجی یا سادە ژ (یەك - ئێك) ێ دەست پێ دکەت تا (نەهێ) ب ژمارەیێن(دەه - بیست - سیه - چل ٠٠٠) دبێژن (سەرەگرێ).

١٠- ژمارەیا بنجیا لێکدای ژی ب ڤی رەنگی پێك دهێت:

ئ- ژ دوو ژمارەیێن بنجی تێکەل وەك: یازدە - دوازدە - هەژدە ....)

ب- ژ دوو ژمارەیێن بنجیێن سادە یان پتر ب هاریکاریا ئامرازێ (و) دابنە ڕەخ ئێك وەك:

بیست و دوو، چل و شەش، سەد و چل و پێنج.

پ- ژ دوو ژمارەیێن بنجیێن سادە بێ هاریکاریا ئامرازێ (و) دابنە ڕەخ ئێك وەك:

شەش حەفت - هەشت نەهـ.

ت- بکارئینانا پەیڤا دەستنیشانکرنا(بڕ)ا وی ناڤی کو دئێخینە پێش ناڤی وەك:

من دوو سەرێن کاڤران هەنە.

کو د ڤێرێدا (دوو سەر) دبیتە ژمارەیەکا بنجیيا لێکدای.

١١- ئەگەر دوو ژمارەیێن بنجی د یەك خانەدا بن (دەهان، بیستان، سیهان ٠ ٠ ٠) ناڤێ هژمارتی دکەڤیتە پشتی هەردووکان وەك:

چوار پێنج مرۆڤ هاتن. (چوار - پێنج) ژخانەیا ئێکانن.

چل و دوو چل و سێ کچ د ڤێ خویندنگەهێدا دخوینن. (هەردوو ژمارە خانەیا چلانن)

بەلێ ئەگەر ئەو دوو ژمارەیێن بنجی د یەك خانەدا نەبن پێدڤییە ل پشت هەر ئێك ژوان ناڤێ هژمارتی بهێتە بەحسکرن وەك:

چل و نەهـ کەس پێنجی کەس هاتن. دروست نینە: چل و نەهـ پێنجی کەس هاتن.(١)

---

(١) گەلەك جاران دشیاندا هەیە بێژین: نەهـ دەهـ زەلام هاتن. بەلێ ئەڤ دەربڕینە دروست نینە. ڕاستییا وێ ئەوە بێژین: نەهـ زەلام دەهـ زەلام هاتن.

**تێبینی:**

ژمارەیا بنجی دگەل پەیڤێن دی بکاردهێن و هەڤالناڤێ لێکدای دروست دکەن وەك:

هەیڤا چواردە شەڤی (چواردە شەڤ)

زارۆکێ ئێك سالی (ئێك سال)

## ڕاهێنان (١)

ئەڤان بۆشاییان ب پەیڤەکا گونجای پڕبکە:

١- وێ دوو ____________ جلکان شوشتن.

٢- هزار ____________ پەرتووك بۆ پەرتووکخانەیا مە ب دیاری هاتن.

٣- ئەڤرۆ من سێ ____________ بزن ژ بازاری کڕین.

٤- ڕەزڤانی شەش ____________ دار سێڤ چاندن.

٥- مام خدری دوو ____________ زەڤی ل گوندی هەنە.

## ڕاهێنان (٢)

دڤان ڕستەیێن خوارێدا هەر پەیڤەکا هێل ب ڕێژا داهاتی شرۆڤە بکە:

١- دوهی کاوەی سێ دانە قەلەم کڕین.

٢- من بیست برادەرو تە یازدە برادەر هەنە.

٣- ئازادی دوو سێ سێڤ خوارن.

٤- هزاران سەرباز د جەنگێدا پشکداربوون.

٥- سەربڕی دوو کاڤرێن قەلەو ڤەکوشتن.

## ڕاهێنان (٣)

١- جیاوازی دناڤبەرا ژمارەیێ بنجینی لێکدای ب هاریکاریا ئامرازێ لێکدەر و ژمارەییێ لیکدای بێ ئامرازێ لێکدەر چییە؟ ب نموونە ڕوون بکە.

٢- جیاوازی دناڤبەرا پەیڤێن هێل ل بندا یێن ڤان دوو ڕستەیین خوارێ چییە؟

ئ: ل ڕوژا پێنجێ ئادارێ گەلێ کورد ڕاپەڕی.

ب- تەمەنێ لەزگینێ برایێ من پێنج ساڵە.

# هەڤالْناڤێ ژمارەیی

## ٢- هەڤالْناڤێ ژمارەیێ ریٚکخستن

ئ- ئەڤان ڕستەیان بخوینە:

١- خویندکارا ئێکێ ( یەکێ ) هەمی سالان ژ لایێ وەزارەتا پەروەردێ ڤە دهێتە خەلاتکرن.

٢- ئەندازیارێ سێیێ ژ زانکۆیا دهوکێ دەرچوویە.

٣- ل سالیادا دەهێ یا راپەرینا گەلێ کوردستانێ هزاران سلاڤ بۆ گیانێ پاکێ شەهیدان.

٤- کەسێ سەد و بیست و دووێ ژ رۆنشتییان برایێ منە.

٥- خانییێ پێنجێ مالا منە و یێ ( ئێ ) شەشێ مالا برایێ منە.

٦- خویندکارا ئێکێ هاتە خەلاتکرن و یا ( ئا ) دوویێ نەهاتە خەلاتکرن.

ب-

١- خوێندکاری یەکەم هەموو ساڵێك لە لایەن وەزارەتی پەروەردە خەلات دەکرێت.

٢- یەکەم خوێندکار هەموو ساڵێك لە لایەن وەزارتی پەروەردە خەلات دەکرێت.

٣- دوومین ( دووهەمین ) کونگرەی مامۆستایانی کورد لە ساڵی ١٩٦٠ز لەشەقلاوە گرێدرا.

٤- لە دەیەمین ساڵیادی راپەرینی گەلی کوردستان هەزاران سلاو بۆ گیانی پاکی شەهیدان.

٥- سەد و بیست و دووەم ( دووەمین ) کەس لە دانیشتوان برای منە.

## بەرچاڤکرن:

ئەگەر تەماشەی ڕستەیێن سەری بکەین دێ بینین:

١- د ڕستەیا ژمارە (١) یا (ئـ)دا، هەڤالناڤێ ژمارەییێ بنجی (ئێك - یەك) مەکرە (ئێکێ - یەکێ) کو هەڤالناڤەکێ ژمارەییێ ڕێکخستنە بۆ هندێ دا پلەو خانەیا وێ خویندکارێ دەستنیشان بکەین یاکو هەمی سالان ژلاییێ وەزارەتا پەروەردێ ڤە دهێتە خەلاتکرن.

ئامرازێ دانەپالێ (ا) بۆ ڕەگەزێ (مێ) کەفتییە دناڤبەرا ناڤێ (خویندکار) و هەڤالناڤێ ژمارەییێ ڕێکخستن (ئێکێ - یەکێ).

٢- د ڕستەیا ژمارە (٢) یا (ئـ)دا هەڤالناڤێ ژمارەییێ بنجی (سێ) مەکرە (سێییێ) کو هەڤالناڤەکێ ژمارەییێ ڕێکخستنە بۆ هندێ دا پلەیا وی ئەندازیاری دەستنیشان بکەین، ئامرازێ دانەپالێ (ێ) بۆ ڕەگەزێ (نێر) کەفتییە دناڤبەرا ناڤێ (ئەندازیار) و هەڤالناڤێ ژمارەییێ ڕێکخستن (سێییێ).

٣-د ڕستەیا ژمارە (٣) و (٤) و (٥) و (٦) یا (ئـ)دا هەڤالناڤێ ژمارەییێ بنجی(دەه) بوویە (دەهێ) و (سەدوو بیست و دوو) بوویە (سەددوو بیست و دوویێ) و (پێنج) بوویە (پێنجێ) و (شەش) بوویە (شەشێ) (ئێك) بوویە (ئێکێ) و ل پاش ناڤێ هـژمارتیێ خۆ هاتییە، ئامرازێ دانەپالێ(ا) بۆ ڕەگەزی (مێ) و ئامرازێ دانەپالێ (ێ) بۆ ڕەگەزێ (نێر) ب کارهاتییە.

٤- د ڕستەیا ژمارە (١) یا (ب)دا هەڤالناڤێ ژمارەییێ بنجی (یەك) مەکرە (یەکەم) کو هەڤالناڤەکێ ژمارەییێ ڕێکخستنە ل پشتی ناڤێ خوێندکار هاتییە، ئامرازێ دانەپالێ (ی) کەفتییە دناڤبەرا واندا.

(خوێندکاری یەکەم).

٥- د ڕستەیا ژمارە(٢) یا (ب)دا هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ ڕێکخستن (یەکەم) پێش ناڤی هاتییە و ئامرازێ دانەپاڵ (ی) بکار نەهاتییە. (یەکەم خوێندکار).

٦- د ڕستەیا ژمارە(٣) یا (ب)دا هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ بنجی (دوو)ب هاریکاریا پاشگرێ (ەمین - هەمین) بوویە ( دووەمین - دووهەمین) کو هەڤاڵناڤەکێ ژمارەییێ ڕێکخستنە، ل پێش ناڤێ (کۆنگرە) بکارهاتییە بۆ دەستنیشانکرنا پلەیا وێ کۆنگرەی، ئامرازێ دانەپاڵ (ی) بکارنەهاتییە. ئەڤ هەڤاڵناڤە یا پەسند ئەوە هەردەم ل پێش هژمارتیێ خۆبیت. بۆ نموونە ئەگەر بهێتە گۆتن:

((پێنجەمین خانوو مالێ ئێمەیە)) پەسند ترە کو بهێتە گۆتن.

((خانووێ پێنجەمین مالێ ئێمەیە))

٧- د ڕستەیا ژمارە(٤) یا (ب)دا هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ ڕێکخستن (دەیەمین) بۆ مەبەستا دەستنیشانکرنا پلەیا ساڵیادا ڕاپەڕینا گەلێ کوردستانێ بکارهاتییە. ئەڤ هەڤاڵکارە ل پێش ناڤێ هژمارتیێ خۆ هاتییە، ئامرازێ دانەپاڵ (ی) دناڤبەرا واندا ب کارنەهاتییە.

٨- د ڕستەیا ژمارە(٥) یا (ب)دا هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ ڕێکخستنێ (سەد و بیست و دووەم (دووەمین) هەڤاڵناڤەکێ لێکدایە و ئەو ژمارە ب هاریکاریا ئامرازێ لێکدەر هاتینە لێکدان و نیشانەیا (ەم) یان (ەمین) دێ چیتە سەر ژمارەیا دوماهیێ، واتە ژمارەیا دوماهیێ دێ نیشانەیا ڕێکخستنێ وەرگریت.

**دەستـــوور:**

١- هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ ڕێکخستن، ئەو هەڤاڵناڤە کو پلەیا هژمارتیێن خوّ ب شێوەیێ ڕێکخستن یان ڕێزبەندی ڕادگەهینیت.

٢- دشیوە زارێ کرمانجییا ژووریدا هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ ڕێکخستن ب هاریکاریا پاشگرێ (ێ) دهێتە دروستکرن، کو دچیتە سەر دوماهیکا هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ بنجی. بوّ نموونە وەکو: (شەش - شەشێ) (دەه - دەهێ) (هزار و سەد و بیست و پێنج - هزار و سەد و بیست و پێنجێ) ٠٠٠

٣- ئـ: ئەگەر هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ بنجی ب ئێك ژڤان پیتێن بزوێن (ا - ێ - وّ - ی) هاتبیت، ناڤبەندا (ی) دێ ئێخینە دناڤبەرا وێ ژمارەیێ و نیشانەیا (ێ)دا بوّ نموونە وەکو:

سێ: سێیێ

ب- ئەگەر هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ بنجی ب پیتا بزوێنا (وو) دوماهی هاتبیت ناڤبەندا (و - ) دێ ئیخینە دناڤبەرا وێ ژمارەیێ و نیشانەیا (ێ)دا، بزوێنا (وو) دێ کورت هێتە گوتن بوّ نموونە وەکو:

دوو + و + ێ = دووێ.

هندەك جاران ناڤبەندا (ی) بکاردئینن: دوو: دوویێ.

پ- ئەگەر هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ بنجی ب پیتا بزوێنا (ە) دوماهی هاتبیت پا پەسند ئەوە بزوێنا (ە) لاببەین و ل جهێ وێ نیشانەیا (ێ) دانین. بوّ نموونە وەکو:

یازدە: یازدەیێ

یازدە: یازدێ. ئەڤە پەسندترە.

٤- د شێوەزارێ کرمانجیا ژووریدا هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ ڕێکخستنێ هەمی دەما دکەڤیتە پشتی ناڤی، بوّ دانەپالێ ژی ئامرازێ دانەپالێ (ا) بوّ ڕەگەزێ (مێ) و ئامرازێ

دانەپالْ ( یْ ) بوْ ڕەگەزێ ( نێر ) ب کاردهێت، ئەگەر ناڤێ هژمارتی دڕستەیەکێدا بهێتە دووبارەکرن و ب ئاشکەرا ناڤێ نەهێنین بوْ ڕەگەزێ مێ ( یا - ئا ) و بوْ ڕەگەزێ نێر ( یێ ئی ) بکار دهێت و شەو ناڤێ هژمارتی هەمی دەما تاکە، بوْ نموونە وەکو:

خویندکارا ئێکێ پەروینە یا ( ئا ) دووێ نازدارە.

خویندکارێ ئێکێ رزگارە یێ ( ئێ ) دووێ جانگیرە.

٥- دشێوەزارێ کرمانجییا خوارێدا هەڤالْناڤێ ژمارەیێ ڕێکخستن ب هاریکارییا ( ەم - هەم ) و ( ەمین - هەمین ) دهیتە دروستکرن. کو دچنە سەر دووماهیا هەڤالْناڤێ ژمارەیێ بنجی ب ڤی ڕەنگی:

ئـ- ئەگەر هەڤالْناڤێ ژمارەیێ بنجی ب پیتا نەبزوێن دوماهی هاتبیت پاشگرێ ( ەم ) یان ( ەمین ) دێ ئێخینە سەر، بوْ نموونە وەکو:

یەك: یەکەم - یەکەمین

شەش: شەشەم - شەمین

ب- ئەگەر هەڤالْناڤێ ژمارەیێ بنجی ب ئێك ژڤان پیتێن بزوێن ( یْ - ە - وْ - ا ) دوماهی هاتبیت، ناڤبەندا ( ی ) دێ ئێخینە دناڤبەرا ژمارەیا بنجی و پاشگرێ ( ەم ) - ( ەمین )، یان پاشگرێ ( هەم - هەمین ) دێ بکارئینین و ناڤبەندا ( ی ) بکارناهێت. بوْ نموونە وەکو:

سێ: ( سێیەم - سییەمین ) - ( سێهەم - سێهەمین )

دە: ( دەیەم - دەیەمین ) - ( دەهەم - دەهەمین )

نوْ: ( نوْیەم - نوْیەمین ) - ( نوْهەم - نوْهەمین )

پ- ئەگەر هەڤالْناڤێ ژمارەیێ بنجی ب پیتا بزوێنا ( وو ) دوماهی هاتبێت ناڤبەندا ( و. ) دێ ئێخینە دناڤبەرا ژمارەیا بنجی و پاشگرێ ( ەم ) - ( ەمین )، بزوینا ( وو ) دێ هێتە کورتکرن بوْ نموونە وەکو:

دوو: دووەم - دووەمین

ئەگەر پاشگرێ ( هەم - هەمین ) بیت پێویستی ب ناڤبەندێ نینە، بۆ نموونە وەکو:

دوو : دووهەم - دووهەمین.

٦- نابیت ل شوینا هەڤالناڤێ ژمارەیێ رێکخستن، هەڤالناڤێ ژمارەیێ بنجی بکاربهێنین. بۆ نموونە دروست نینە بێژین:

( سالا ئێك ) ل شوینا ( سالا ئێکێ )

( سالی یەك ) ل شوینا ( سالی یەکەم )

٧- هەڤالناڤێ ژمارەیێ رێکخستن ئەوێ ب هاریکارییا پاشگرێ ( ەمین - هەمین ) درست دبیت، ئەگەر ل پێش ناڤێ هژمارتییێ خۆبیت پەسندترە.

بەلێ ئەوێ ب هاریکارییا پاشگرێ ( ەم - هەم ) دروست دبیت ل پێش یان ل پاش ناڤێ هژمارتییێ خۆ بیت دروستە. بۆ نموونە وەکو:

( یەکەمین سالێ - سەد و بیست سێیەمین ( سێهەمین ) کەس. یەکەم سالێ - سالی یەکەم )

# هەڤالناڤێ ژمارەیی

## ٣- هەڤالناڤێ ژمارەییێ کەرتی

١-

ئـ- $\frac{١}{٣}$ سێیەکا (سێئێکا) پەزێن خوٚ من فروٚشت.[١]

بـ- سێیەکی مەڕەکانی خوٚمم فروٚشت.

٢-

ئـ- $\frac{٢}{٨}$ دوو هەشت یەکی (دووهەشتێکا) بەرهەمێ ڤێ کارگەهێ بوٚ هەژارانە.

بـ- دوو هەشت یەکا بەرهەمی ئەم کارگەیە بوٚ هەژارانە.

٣-

ئـ- $\frac{٣}{٢٠}$ سێ بیست یەکا (سێ بیستێکا) خویندکاران ل ئەزموونا ڕێزمانا کوردی دەرنەچوون.

ب- سێ بیستیەکی خویندکاران لە ئەزموونی ڕێزمانی کوردی دەرنەچوون.

---

(١): (سێکا) ژی دهێتە گوتن.

٤-

ئـ- ٢٥٪ ژ سەدان بیست و پێنج کرێکارێن ڤیٚ کارگەهیٚ نەخویندەڤانن.[(١)]

بـ. لە سەدان بیست و پێنجی کرێکارانی ئەم کارگەیە نەخوێندەوارن.

٥-

ئـ- ٠,٧ ژ دەهان حەفت کچێن قوتابخانامە خەلکیٚ دهۆکێنە.

بـ - لە دەیان حەفتی کچانی قوتابخانەکەمان خەڵکی دهۆکن.

٦-

ئـ- ٠,٤٠ ژ سەدان چل مامۆستا خودان خانینە.

بـ- لە سەدان چل مامۆستایان خانووی خۆیان هەیە.

٧-

ئـ- ٠,٢٤٧ ژ هزاران دوو سەد وچل و حەفت سەرباز دجەنگێدا هاتنە کوشتن.

بـ -لە هەزاران دوو سەد و چل و حەفتی سەربازان لە جەنگدا کوژران.

٨-

ئـ- $\frac{١}{٢}$ نیڤەکا دارستانیٚ هاتە سووتن.[(٢)]

بـ- نیوەی دارستانەکە سووتێنرا.

---

(١) (بیست و پێنج ژ سەدیٚ) ژی دهێتە گۆتن.

(٢) (نیڤا) ژی دهێتە گۆتن.

## بەرچاڤكرن:

د خواندنا رستەيێن سەريدا بۆ مە دەردكەڤيت كو د هەر رستەيەكێدا هەڤالناڤێ ژمارەيى هەيە كو هويرييا وى ناڤێ هژمارتيێ پشتى خۆ نيشان ددەت و ئەندازەياوى كەرتى رادگەهينيت.

١- درستەيا ژمارە ئێك يا (ئـ) و (بـ)دا هەڤالناڤێ ژمارەيى (سێيەك) ئەندازەيا پەزێن (مەرێن) هاتينە فروشتن نيشان ددەت و ژدوو ژمارەيێن بنجى (سێ) و (يەك) پێكهاتييە كو ب هاريكارييا ئامرازێ دانەپالێ (ا) و (ى) كارێ خۆ كرييە.[1]

ئەڤ جۆرە پێكهاتنە تنێ دێ د وان جۆرە ژمارەياندا دبيت يێن كو ژمارەيا دووێ (يەك) بيت، وەك

(چواريەك - چوارێك) (شەشيەك - شەشێك) ...

٢- د رستەيا دووێ (ئـ) و (بـ)دا هەڤالناڤێ ژمارەيى كەرتى يێ كو ئەندازەيا وى بەرهەمى دەردئێخيت يێ بۆ هەژاران هاتييە تەرخانكرن هەڤالناڤێ (دوو هەشت يەك)ە، كو ژمارەيێن بنجى (دوو - هەشت - يەك) پێكهاتييە و ب هاريكارييا ئامرازێ دانەپالێ (ا) ، (ى) كارێ خۆ كرييە. دڤێرە ژى دا هەر ب هاريكارييا ژمارەيا (يەك) دروست دبيت و دئێخنە پشت ژمارەيا دووێ كو ژمارەيا ژێرييە.

---

١) (ا) ئامرازى دانەپاڵە دكرمانجييا ژووريدا.

(ى) ئامرازى دانەپاڵە دكرمانجييا ژێريدا.

خواندنا ڤان جۆره هەڤاڵناڤێن ژمارەیێن کەرتی دێ ب ڤی شێوەی بیت.
ل دەستپێکی هژمارا سەری و لدویڤدا هژمارا ژێری پاشی هژمارا (ئێك) دێ ئێخینە سەر. ئەڤ جۆرە خواندنە دوان ژمارەیێن کەرتی دەردکەڤن ئەوێن هژمارا سەری ژ ئێکێ پتر بیت، ( سێ پێنج یەك)، (شەش حەفت یەك)،( بیست شێست یەك) ... هتد.

٣- د هەردوو ڕستەیێن ژمارە (٣) ژی دا دیسان هەڤاڵناڤێ ژمارەییێ کەرتی (سێ بیست یەك) ژ سێ هژماران پێکهاتییە (سێ - بیست - یەك) و ب هاریکارییا ئامرازێ دانەپاڵ (ا) د ڕستەیا ئێکێدا (ی) د ڕستەیا دوویێدا کارێ خۆ کرییە.

٤- د ڕستەیا ژمارە چوار یا (ئـ) و (بـ)دا ژی، ئەڤ جۆرە کەرتە ب ڤی شێوەی دهێنە خواندن: (ژ) یان (لە) لدیڤدا ژێرییا کەرتی، کو (سەد)ە، پاشی هژمارێ دێ خوینین. بۆ نموونە وەکو: ( $\frac{٢٥}{١٠٠}$ - ٢٥٪) (ژ - لە) سەدان بیست پێنج ئەڤ جۆرە ژمارە کەرتییە دبێژنێ (کەرتێ سادە).[1]

٥- دڕستەیێن ژمارە (٥) و ( ٦) و (٧) ژی دا ژمارەیێن کەرتی، کەرتێن (دەهی) و (سەدی) و (هەزاری) نە و ب ڤی شێوەی دهێنە خواندن:
ئـ- (ژ - لە) دەهان (دەیان ... پاشی وێ هژمارێ.
ب- (ژ - لە) سەدان ... پاشی وێ هژمارێ.

---

(١) ( ژ) د کرمانجییا ژووریدا.
(لە) د کرمانجییا خوارێدا.

پ- (ژ - لـه) هزاران ............. پاشی وێ هژمارێ.

٦- هـژمارا (ئێـك) و (دوو) ناكەفتـه بـەر دەسـتورێ خوانـدنا كـەرتێن دیتـر كـو ژمارەیا سەری (ئێك) بیت ویـا ژێـری (دوو) بیت ( $\frac{١}{٢}$ ) .

(نیڤ + نیو) دهێته گوتن.

نیڤەكا گەنمێ من هاته سووتن.

نیڤ سیڤ بۆ منه.

## دەســتــوور:

١- هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ كەرتی بەشەكێ ژ هژمارا تمام نیشان ددەت، واتـه ئەنـدازەیێ وی كـەرتی رادگـەهینیت، ئـەو ئەنـدازە ژێ پێكهاتییـە ژ چـەندایەتییا هـەردوو بەشێن وی كەرتی، ئەو پیشاندان ژێ ب هاریكارییا ئـامرازێن دانـەپاڵ (ا) و (ێ) و (ی) دهێنه بجه ئینـان، ئـەو نـاڤێ پەسـنكری (وەسـفكری) ژێ ل پشـت وێ ژمارەیـا كەرتی دهێت، ئەڤ جۆرێ هەڤاڵنـاڤێ ژمارەیێ هەمی دەما لێكداینه.

٢- ئەگەر سەرەیێ هەڤاڵناڤێ كەرتی یەك (ئێك) بوو، بـەلێ ژێرەیـێ ژمـارەی (سـێ، چـوار) بـوو، د گوتنێـدا ژێـره دێ هێتـه گـوتن پاشـی (ئێـك) یـان یـەك وەك (چار ئێك) (چوار یەك) (هەشت یەك).

٣- ئەگەر سـەرە دوو یـان پتـر بـوو، دگوتنێـدا، سـەرە دهێتـه گـۆتن پاشـی ژێـره و ل دوماهیێ ژمارە (ئێـك - یـەك) دێ ئێخینـه سـەر وەك (سێ هەشت ئێك - دوو پێـنج یەك، هندەك جاران ب ڤی رەنگی دهێته خواندن (سـێ ل سـەر هەشتێ) (دوو ل سـەر پێنجێ).[1]

---

(١) ئەڤ جۆرێ خواندنێ تازە هاتییە ناڤ زمانێ كوردی.

## ڕاهێنان (١)

١- جیاوازی هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ ڕێکخستن لگەل هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ بنجی چییە؟

ئ- ژ لایێ پێکهاتنێ

ب- ژ لایێ بکارهێنانێ

٢- ئەو ژمارەیێن بنجی کو دوماهیکا وان ب بزوێنا ( ە - ا - وٚ - یٚ ) دهێن چەوا دکەنە هەڤاڵناڤێ ژمارەیێ ڕێکخستن.

## ڕاهێنان (٢)

نەدروستییا ئەڤان ڕستەیێن خوارێ دیاربکە و پاشی ب دروستی بنڤیسە.

١- کرێکارێ دوو ژلایێ ڕێڤەبەرێ کارگەهامە هاتە خەلاتکرن.

٢- سالێ دووەمین راپەڕینی گەلی کوردستان پەرلمان و حومەتی هەرێم دامەزران.

٣- قوتابییا پێنج ل وانێن زانستی یا باش نینە.

٤- خانییا چارێ مالا هەڤاڵێ منە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەو پەیڤێن هێل ل بندا شروڤە بکە:

١- هوزانڤانێ ئێکێ یێ چوارین نڤیسین بابە تاهرێ هەمەدانی بوو.

٢- نیڤەکا خوێندکارێن ڤێ پوٚلێ ل دوو وانان کەفتینە.

٣- کرێکاری دووەم خەلاتکرا.

٤- چوار ئێکا خەلکێ ڤی گوندی هەژارن.

# هەڤاڵناڤێ نەدیار

ئەڤێن ل خوارێ بخوینە:

١- کەکێ منۆ

چ دارەکا رەه درێژم

دڤی واریدا

باو باهۆزێد پاییزێ

بەڵگ وەراندن

تا قراندن

(عەبدولرحمان مزوری)

٢- هەر ماهێ نەو بوو حالم پەشێوەن

چون هیلال شێوەی ئەبرۆی تۆش پێوەن

(مەولەوی)

٣- نەقدێ مە د بوو ب سکە مەسکووك

ئەدما وەهەبێ رەواج و مەشکووك

(ئەحمەدێ خانی)

٤- زۆر باران باری.

٥- میرزای هندەك کاڤر فرۆشتن.

## بەرچاڤکرن:

بنێڕە وان هوزان و ڕستەیێن سەری دێ بینی:

١- د دێرا ئێکێدا، پەیڤا (چ) وەکی هەڤاڵناڤی بکارهاتییە و ل پێش پەیڤا (دارەك) هاتییە دانان و ب شێوەیەکێ نەدیار پەسنا (وەسفا) ناڤێ (دارەك) دکەت، ژبەر هندێ ئەو پەیڤ دبیتە ( هەڤاڵناڤێ نەدیار).

٢- د دێرا دوویێدا، پەیڤا (هەر) وەکی هەڤاڵناڤی بکارهاتییە و ل پێش پەیڤا (ماهێ) هاتییە دانان و ب شێوەیەکێ نەدیار پەسنا ناڤێ (ماه)ێ دکەت و بۆمە دەستنیشان ناکەت کو دکیژ هەیڤێدا حالێ وی تێکدچیت، ژبەر هندێ ئەو پەیڤ دبیتە ( هەڤاڵناڤێ نەدیار).

٣- د دێرا سێیێدا، پەیڤا (وەهە) وەکی هەڤاڵناڤی بەری ناڤێ (رەواج) هاتییە و ب شێوەیەکێ نەدیار وەسفا وێ بێ رەواجیێ کرییە، ب جۆرەکی کو نەشێین دەستنیشانا رادەیێ وێ بێ رەواجیێ بکەین، ژبەر هندێ ئەو پەیڤ دبیتە ( هەڤاڵناڤێ نەدیار).

٤-درستەیا ژمارە (٤ - ٥)دا پەیڤێن ( زۆر - هندەك) هەر ئێك ژ وان دگەل ناڤەکی هاتییە و وەسفا وی ناڤی دکەت بەلێ ب شێوەیەکێ نەدیار، ژبەر هندێ دبێژنێ ( هەڤاڵناڤێ نەدیار).

**دەستـــوور:**

١- هەڤاڵناڤیێ نەدیار، هەڤاڵناڤەکە کو جۆر و چەوانی، یان ژمارە و ( بڕ )ا وی ناڤی ب شێوەیەکێ نەدیار دەستنیشان دکەت و یان پێش وی ناڤی دێ هێتە دانان، وی دەمی پێدڤی ب ئامرازێ دانەپاڵ نابیت ( وەکو وان نموونەیێن هاتینە بەرچاڤکرن )، یان دێ پشتی وی ناڤی هێتە دانان، وی دەمی پێدڤی ب ئامرازێ دانەپاڵ ( خستنەسەر ) دبیت. بۆ نموونە وەك: بارانەکا زۆر باری.

٢- هندەك ژوان هەڤاڵناڤێن نە دیار ئەڤەنە :

چەند، هەندێ، هەر، هەمی، گشت، دی، دیتر، دن، تەڤ، فلان، بێڤان، هندە، هند، هۆسا، وەسا، وەتوف، چ، گەلەك، زۆر، کێم ( کەم )، پیچەك، هەمی، بڕەك .

٣- پەیڤا ( هەر ) هەمی دەما هەڤاڵناڤە، پەیڤێن ( زۆر -گەلەگ -هندەك - پیچەك- کێمەك _ _ _ ) هندەك جاران هەڤاڵناڤن و هندەك جاران ژێ دبنە هەڤاڵکار. بۆ نموونە وەکو: باران زۆر باری.

ئەڤێن دی ( فلان - کەس ) ئەگەر ناڤێ دگەلدا بکارنەهێن دبنە ( جێناڤێ نەدیار ). بۆ نموونە وەك:

فلان هات .　　　　فلان چوو.

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەڤێن ل خوارێ بخوینە و هەر هەڤاڵناڤەکێ نەدیار تێدابیت دەربینە:

١- ئەڤ رۆم و عەجەم بوان حەسارن
کرمانج هەمی ل چار کنارن

(خانی)

٢- وان مەغوولا راڤ دبەستن شێرو مێر سەر دهنجنین
توخم و نفشێ وان قەلاندن هەمی گاڤا د پەچنین

٣- نە نەسرین بەسە باسی ئێستەمان
هیچ دادی نییە فرمێسك رژان
رۆییو، رۆییوە، ئێستاش ئاوایە
دوا رۆژیش لە دەست من تۆدایە

٤- ساڵەكادی باشتر بخوینە.
٥- هەر كەسەكی پێدڤی ب زانینێ هەیە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەڤان هەڤاڵناڤێن نەدیار دڕستەییێدا بكاربینە:
( پیچەك، هیچ، هەندێك، هەمی، هەر، دن)

## ڕاهێنان (٣)

ئەڤان ڕستەییێن خوارێ شرۆڤەبكە:
١- من چەند پەرتووكەك كڕین.
٢- مە دیمەنێ هۆسا نەدیتییە.

# جێناڤێ نەدیار

ئەڤان ڕستەیان بخوینە:

١- هەمی ل تاقیکرنێ دەرچوون.

٢- گشت ئامادەبوون.

٣- ئەز فلانی دنیاسم.

٤- کابرا دکارێ خۆدا سەرنەکەفت.

٥- من هیچ ژبیـر نەکرییە.

٦- من تشتەك ژبیـر نەکرییە.

٧- کەس دڤێرێرا نەچوویە باژێری.

٨- ئازادی چ نەخاریە.

## بەرچـاڤـکـرن:

بەری نهۆ مە زانییە کو جێناڤ ل جهێ ناڤەکی درستێدا بکاردهێت، ڤێجا ئەگەر تەماشەی ڕستەیێن سەری بکەین، دێ بینین دهەر ڕستەیەکێدا جێناڤـەکێ نـەدیار هەیـە، کـو ل جهـێ نـاڤێ مرۆڤـەکی.. گیانـەوەرەکی .. تشـتەکی هاتییـە بکارئینـان، و ب شـێوەیەکێ ئاشـکەرا ئـەو نـاڤ دیـار نەکرییە، و ب ئەڤی رەنگێ خوارێ:-

١- د ڕستەیا ئێکێدا پەیڤا (هەمی) جێناڤێ نەدیارە، چونکە ل جهێ چەند ناڤـەکان بکارهاتییـە، و ب ئاشـکەرایی ئـەو ناڤـە نەهاتینـە دیـارکرن، و ژ لایێ پێکهاتنێڤە سادەیە، چونکە ژ ئێك پەیڤا واتادار پێکهاتییە.

٢- د ڕسـتەیا دوویـێدا پـەیڤا (گشـت) جێنـاڤێ نـەدیارە، چـونکە ل جهـێ کۆمەڵـەکا ناڤـان بکارهاتییـە، و ب ئاشـکەرایی ئـەو ناڤـە نەهاتینـە دیارکرن.

٣- د ڕستەیا سێییێدا پەیڤا (فلان) جێناڤێ نەدیارە، چونکە ل جهـێ ناڤێ مرۆڤەکی بکارهاتییە کو ب ئاشکەرایی ئەو ناڤ نەهاتییە دیارکرن.

٤- د ڕستەیا چوارێدا پەیڤا (کابرا) جێناڤێ نەدیارە، چونکە ل جهـێ ناڤێ مرۆڤەکی بکارهاتییە کو ب ئاشکەرایی ئەو ناڤ نەهاتییە دیارکرن.

٥- د ڕستەیا پێنجێدا پەیڤا (هیچ) جێناڤێ نەدیارە، چونکە ل جهـێ ناڤێ تشتەکی بکارهاتییە کو ب ئاشکەرایی ئەو ناڤ نەهاتییە دیارکرن.

٦- د ڕستەیا شەشێ دا پەیڤا (تشتەك) جێناڤێ نەدیارە، چونکە ل جهـێ ناڤێ تشتەکی بکارهاتییە کو ب ئاشکەرایی ئەو ناڤ نەهاتییە دیارکرن.

٧- د ڕستەیا حەفتێدا پەیڤا (کەس) جێناڤێ نەدیارە، چونکە ل جهـێ ناڤێ تشتەکی بکارهاتییە کو ب ئاشکەرایی ئەو ناڤ نەهاتییە دیارکرن.

٨- د ڕستەیا هەشتێدا پەیڤا (چ) جێناڤێ نەدیارە، چونکە ل جهـێ ناڤێ تشتەکی بکارهاتییە کو ب ئاشکەرایی ئەو ناڤ نەهاتییە دیارکرن.

**دەستوور:**

**جێناڤێ نەدیار ئەو پەیڤە کو ل جهێ ناڤێ مرۆڤەکی یان گیانەوەرەکی یان هەر تشتەکێ دی بهێتە بکارئینان کو ئەو ناڤ ب ئاشکەرایی دیار نینە کانێ کییە؟ یان چییە؟ وەکی ( هەمی ، هەموو، گشتت، فلان، فیسار، بیڤان، کابرا، هیچ، تو، کەس، تشت، هەندێك، هندەك، خڕ، زۆر، گەلێك، گەلەك، تەڤ، ئەودی، هندە ... ).**

# ئەركێ جێناڤێ نەدیار د رِستەییێدا

ئەڤان رِستەیان بخوینە:

١- فلان زۆر زانە.

٢- کەس ل ئاهەنگا نەوروزێ گیرو نەبوو.

٣- هوین هەمیێ دزانن.

٤- ئەوان هەوالێ بۆ فلانی ڤەگوهاستن.

٥- هەسپێ کابرای هاتە دزین.

٦- هندەك بۆ دەرڤەی وەلاتی هاتنە هنارتن.

٧- کێم و کاسی ژ کابرای بوو.

**بەرچاڤکرن:**

بەری نهۆ مەزانی کو جێناڤێ نەدیار ل جهێ ناڤەکی درِستەییێدا بکاردهێت و ژبەر هندێ هەمی ئەرکێن ناڤێ درستێدا دبینیت، وەکو:-

١- د رِستەیا ئێکێدا پەیڤا (فلان) جێناڤێ نەدیارە، ئەرکێ نیهادی دیتییە.

٢- د رِستەیا دوویێدا پەیڤا ( کەس) جێناڤێ نەدیارە، ئەرکێ بکەری دیتییە.

٣- د رِستەیا سێیێدا پەیڤا ( هەمیێ) جێناڤێ نەدیارە، ئەرکێ بەرکاری دیتییە.

٤- د رِستەیا چوارێدا پەیڤا (فلان) جێناڤێ نەدیارە،ئەرکێ تەواوکەرێ بەیاریدەی دیتییە.

٥- د ڕستەیا پێنجێدا پەیڤا ( کابرا) جێناڤێ نەدیارە، ئەرکێ دیارکەرێ ناڤی دیتییە.

٦- د ڕستەیا شەشێدا پەیڤا ( هندەك) جێناڤێ نەدیارە، ئەرکێ جێگرێ بکەری دیتییە.

٧- د ڕستەیا حەفتێدا پەیڤا ( کابرا) جێناڤێ نەدیارە، ئەرکێ تماکەرێ کارێ ناتەواو دیتییە.

**دەستـــوور:**

جێناڤێ نەدیار کو ل جهێ ناڤەکێ بکاردهێت، ئەرکێ ناڤی درستێدا دبینیت. وەکو ( بکەر، نیهاد ، بەرکار، تەواوکەری بەیاریدە، دیارکەرێ ناڤی، تمامکەرێ کارێ ناتەواو، جێگرێ بکەری.)

## ڕاهێنـان (١)

ئەڤان جێناڤان دڕستەیاندا بکاربینە:

گشت ، هەمی ، کەس ، چ ، کابرا

## ڕاهێنـان (٢)

جێناڤێ (فلان) د حەفت ڕستەیاندا بکاربینە، د هەر ڕستەیەکێدا ئەرکەکێ ناڤی وەربگریت.

## ڕاهێنان (٣)

د ئەڤان ڕستەیێن خوارێدا جێناڤێن نەدیار بینەدەرێ و ئەرکێ وان بنڤیسە:

١- خڕ هاتبوون.

٢- مە چ نەکرییە.

٣- تە فلان بۆ کیرێ هنارت؟

٤- کەس ژ هەڤالێن من نەهاتییە.

٥- ئەم هەمییێ دزانین.

٦- ئەڤە فلان بوو.

٧- بلا کەس نەهێتە گرتن.

## ڕاهێنان (٤)

ئەڤان ڕستەیێن خوارێ شرۆڤە بکە:

١- من پەرتووکەك بۆ کابرای بەخشی.

٢- شڤانی چ نە نڤیسییە.

## ڕاهێنان (٥)

ئـ- جوداهی دناڤبەرا هەڤاڵناڤێ نەدیار و جێناڤێ نەدیار دا چییە؟ ب نموونە ڕوون بکە.

ب- ئەڤان پەیڤان (هیچ ، هەمی ، گشت ، چ) دڕستەیاندا بکە هەڤاڵناڤێ نەدیار و جارەك دی جێناڤێ نەدیار.

# كــاریٚ داریٚژتــی

١- قەلاٚتی زیوی ڕووخاوە هەرەس بە توٚیی نەسیم
سەپاهــی لالەو گوٚڵ چادری لـــە جیٚ هـــەڵدا

(حاجی قادری کوٚیی)

٢- مەمیٚ ڕەبەن ئەڤیندار بوو
بەکــوٚ ڕابوو ژەهر تـیٚکــر
ب کینا ڕەش ڤــەکـوٚلا بوو
ب زینــدانا جزیــریٚ کــر

(سەبری بوٚتابی)

٣- کە دەرکەوت مانگی دوو حەفتە سەراپەردەی دەرخشان کرد
بەعینوانی سەفا دەستی جــەفــای لــەو نــاوەدا دەرکـــرد

(بیٚخود)

٤- خەرامان دەرکەوت لە توٚییٚ پەردەوە
پەچەی لە ڕووخسار مــانگ لابردەوە

٥- بــاهــوٚز و بــاگــەڕ و بــاران
نەمان چوون و وەلات بەردان.

(سەبری بوٚتابی)

٦- لە ورشەی شەونم لە توٚییٚ پەردەوە
نـەرگس بـە مـەستی چــاوی کــردەوە

(مەولەوی)

## بەرچاڤكرن:

دەمێ تەماشەی ئەڤان مالكێن هۆزانان دكەین، دێ بینین پەیڤێن (هەڵدا، ڕابوو ، تێكر ، ڤەكۆلا ، دەركەوت ، دەركرد ، لابردەوە ، بەردا، كردەوە) هەمی كارن، لێ ئەگەر بپرسین چ جۆرە كارن ژلایێ دروست كرنێ ڤە، دێ بێژین كارێن دارێژتینە، چونكە هەر ئێك ژ وان ژ كارەكێ سادە دگەل پێشگری یان پاشگری یان هەردووان پێكهاتییە، ب ئەڤێ شێوەی خوارێ:

١- د مالكا هۆزانا ئێكێدا كارێ (هەڵدا) كارەكێ دارێژتییە، ژ پێشگرێ (هەڵ) و كارێ سادە (دا) پێكهاتییە، و بوویە كارەكێ دارێژتی، ژ چاوگێ دارێژتی (هەڵدان) هاتییە وەرگرتن.

٢- د مالكا هۆزانا دوویێدا كارێن (ڕابوو ، تێكر، ڤەكۆلا) دارێژتینە، كارێ (ڕابوو) ژ پێشگرێ (ڕا) وكارێ سادە (بوو) پیكهاتییە، و بوویە كارەكێ دارێژتی، ژ چاوگێ دارێژتی(ڕابوون) هاتییە وەرگرتن. كارێ (تێكر) ژ پێشگرێ (تێ) و كارێ سادە (كر) پێكهاتییە، و بوویە كارەكێ دارێژتی، ژ چاووگێ دارێژتی (تێكرن) هاتییە وەرگرتن. كارێ (ڤەكۆلا) ژ پێشگرێ (ڤە) و كارێ سادە (كۆلا) پێكهاتییە، وبوویە كارەكێ دارێژتی، ژ چاووكێ دارێژتی (ڤەكۆلان) هاتییە وەرگرتن.

٣- د مالكا هۆزانا سێییێدا كارێن (دەركەوت - دەركرد) دارێژتینە، كارێ (دەركەوت) ژ پێشگرێ (دەر) وكارێ سادە (كەوت) پێكهاتییە، و بوویە كارەكێ دارێژتی، ژ چاوگێ دارێژتی (دەركەوتن) هاتییە وەرگیران، كارێ (دەركرد) ژ پێشگرێ (دەر) وكارێ سادە (كرد) پێكهاتییە، و بوویە كارەكێ دارێژتی، ژ چاوگێ دارێژتی (دەركردن) هاتییە وەرگرتن.

٤- د مالْكا هوْزانا چواريْدا كاريْن (دەركەوت ، لابردەوە) داريْژتينە.
كاريْ (دەركەوت) ژ خالا سێييْدا مە بەحس لیْ كریە، كاريْ (لابردەوە) ژ پيْشگريْ (لا) و كاريْ سادە (برد) وپاشگريْ (ەوە) پيْكهاتييە، وبوويە كارەكیْ داريْژتی ژ چاوگیْ داريْژتی (لابردنەوە) هاتييە وەرگرتن.

٥- د مالْكا هوْزانا پيْنجيْدا كاريْ (بەردا) داريْژتييە، ژ پيْشگريْ (بەر) و كاريْ سادە (دا) پيْكهاتييە، وبوويە كارەكیْ داريْژتی، ژ چاوگیْ داريْژتی (بەردان) هاتييە وەرگرتن.

٦- د مالْكا هوْزانا شەشيْدا كاريْ (كردەوە) داريْژتييە، ژ كاريْ سادە (كرد) و پاشگريْ (ەوە)پيْكهاتييە، وبوويە كارەكیْ داريْژتی، ژ چاوگیْ داريْژتی (كردنەوە) هاتييە وەرگرتن.

**دەستوور:**

**كاريْ داريْژتی كارەكیْ نەسادەيە ژ كارەكیْ سادەيیْ واتادار و پيْشگرەكی يا پاشگرەكی كو دبیْ واتانە يان دگەل هەر دووان پيْك دهيْت. و ب ئەڤیْ شيْوەيیْ خواریْ:**

**١) پيْشگر + كاريْ سادە = كاريْ داريْژتی.**

**هەلدا ، هەلگرت ، ڕاكر ، ڕاگرت ، ڕاپەری ، ڕاخست ، ڕامالی ، وەرگرت ، وەرپيْچا ، داچوو ، داگرت ،داخست ، ڤەكر ، پيْكر ، تيْكر ، ليْدا .**

**تيبينی:-**

ئەڤان پيْشگران بتنیْ چ واتا نينن، ل پيْشيا كاريْ سادە دهيْنە لكاندن، ب گشتی پيْشگريْ (هەلْ) ڕامانەكا بلندی و بەرڤ سەری ددەت، لیْ پيْشگریْ

(دا) ڕامانــەکا بــەرەف نزمیــێ ددەت، پێشــگرێ (ڕا) لڤینــەکا ڕاســتەوخۆ دیاردکەت، پێشگرێ (وەر) ڤەگەڕیان و گهوڕینا جهی دیاردکەت.

(هەلگرت ، هەڵدا ، هەڵکەفت)

(داگرت ، دانیشت ، داخست ، دادا ... هتد)

( ڕابوو ، ڕاماڵی ، ڕاخست ، ڕاکێشا ، ڕاگرت ، ... هتد)

( وەرگەڕا ، وەرگرت ، وەرپێچا ، وەربادا ... هتد)

٢- پێشگر + کارێ سادە + پاشگر = کارێ دارێژتی.

هەڵ دایەوە / داخستەوە / هەڵخستەوە

هەڵ + دا + یـ + ەوە = هەڵدایەوە.

دا + خست + ەوە (ڤە) = داخستەوە (داخستەڤە)

هەڵ + دا + ڤە = هەڵداڤە.

وەر + پێچا + ڤە = وەرپێچاڤە.

ڤە + مر + اند = ڤەمراند

٣-کارێ سادە + پاشگرێ (ەوە - ەڤە) = کارێ دارێژتی.

خوارد + ەوە = خواردەوە.

چوو + ەوە = چووەوە.

خوار + ەڤە = خوارەڤە.

چوو + ڤە = چووڤە.

هات + ەڤە = هاتە ڤە.

یان:

کارێ سادە + پاشگرێ (اند) = کارێ دارێژتی.

ڕژا + اند = ڕژاند             سووتا + اند = سووتاند

**تێبینی:-**

پاشگرێ (ەوە) دزارێ کرمانجییا خوارێدا دچیتە سەر کارێ سادە و پشتی کو دکەتە کارەکێ دارێژتی ئەڤان گهوڕینا نیشا ددەت:-

ئ- واتایەکا نوی و یا جودا ژ کارێ سادە پەیدا دکەت. وەکو:

برد + ەوە = بردەوە     د ڤێرێدا ب ڕامانا سەرکەفتنێ دهێت.

کرد + ەوە = کردەوە     دڤێرێدا ب ڕامانا ڤەکرنا دەرگەهی یان پەنجەرێ یا هەر تشتەکێ گرتی دهێت.

چوو + ەوە = چووەوە   دڤێرێدا ب ڕامانا تێکچوونا ڕەنگی دهێت.

وەك:

- یاریەکان بردەوە.
- پەنجەرەکەی کردەوە.
- ڕەنگی کراسەکەی بەهەتاو چووەوە.

ب- ب ڕامانا دووبارەکرنێ بکاردهێت:

هات + ەوە = هاتەوە.

برد + ەوە = بردەوە.

کرد + ەوە = کردەوە.

- هاوڕێ جارێکی تر هاتەوە بۆ لامان.
- ئەم جارەش کتێبەکەی بردەوە.
- نویژەکەم کردەوە.

پ- هندەك جاران دچیتە سەر کارێ سادە، ڕامانا کاری تمام دکەت، چونکە کارێ وەسا مە هەیە کو دەمی یێ سادە ڕامانێ نادەت.

وەك:

حەسا + ی + ەوە = حەسایەوە.

دۆزی + ی + ەوە = دۆزییەوە.

کولا + ی + ەوە = کولایەوە.

لەرا + ی + ەوە = لەرایەوە.

. میوانەکە لە لامان حەسایەوە.

. پارەکەمان دۆزییەوە.

. برینەکەی کولایەوە.

**تێبینی:-**

پاشگرێ (اند) د بنیاتدا (اندن)ە، دەمێ دچیتە سەر قەدی یان رەگێ چاوگێ سادەیێ تێنەپەر، چاوگێ دارێژتی یێ تێپەر دروست دکەت. وەك:

ڕژا + اند = ڕژاندن.

چەر + اندن = چەراندن.

مر + اندن = مراندن.

سەپا + اندن = سەپاندن.

پشتی لابرنا (ن)ا چاوگی کارەکێ دارێژتی یێ تێپەر دروست دبیت، چونکە وەکی ئەم دزانین هەمی کار ژ چاوگان دهێنە وەرگرتن.

**تێبینی:-**

ل بەرامبەری پاشگرێ (ەوە) د زارێ کرمانجییا ژووروودا پێشگرێ (ڤە) بکاردهێت. وەك:

ڤە + کر = ڤەکر.

ڤە + مر + اند = ڤەمراند.

ڤە + خوار = ڤەخوار.

ڤە + بوو = ڤەبوو.

ڤە + ما = ڤەما.

ڤە + دا = ڤەدا.

. دەرگەھ ڤەکر.

. ئاگر ڤەمراند.

. پەنجەر ڤەبوو.

## ڕاهێنان (١)

د ئەڤان مالکێن هۆزانێدا هەر چ کارەکێ دارێژتی هەبیت، بینە دەرێ و پێکهاتنا وی دیاربکە.

١- گەلێکم ڕۆژ گاری تاڵ و شیرین ڕابوارد، ئاخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی تر

(هێمن)

٢- چەند جار سوتام و هەلگەڕامەوە
بووم بەخۆڵەمێش دامرکامەوە

(شێخ سەلام)

٣- شەتری وتاییێن سوور و زەر
بایێ نەسیم لێدا سەحەر
ل وێ جەبهەتێ هژیان دووبەر
لەورا سوکاری بێ هشین

(مەلایی جزیری)

٤- لێم گەڕێ با دەربڕم سۆزی دەروون

لێم گەڕێ با هەڵوەرێنم ئەشکی روون

(هێمن)

٥- گولێ جانێ تە ئەز برم

ژ دنیایێ ئەز دەرکرم

(سەبری بوتانی)

## ڕاهێنان (٢)

ئەڤ پێشگر و پاشگرێن ل خوارێ چ رامان نیشاددەن، ژ هەر ئێک ژ وان دوو کارێن دارێژتی دروست بکە، ودڕستەیاندا بکاربینە:

(هەڵ ، دەڤ ، ڤە ، دا ، دوە)

## ڕاهێنان (٣)

ئەڤان ڕستەیان شرۆڤەبکە:

١- مە ئالایێ کوردستانێ ل هەمی جهان ڕاگرتییە.

٢- وی بەرپەرێن گوڤارێ هێدی هێدی ڤەدانەڤە.

٣- ئازادی پەنجەر ڤەکر.

٤- مەمۆی ئاگرێ نەورۆزێ هەلکر.

# کـــاریٚ لـیٚـکـدای

ئـ-

١- میـری نەڤ پیٚشمەرگە خەلات کر.

٢- ماموٚستای سەرا قوتـابییٚن نەخوٚش دا.

٣- نەخوٚشی نـالٚە نـالٚە کر.

٤- ئەوی کاریٚ خوٚ دەست پیٚکر.

٥- رووداوەکەیـان لە یـادکرد.

٦- سەرداری چیـروٚك ژ بیـرکر.

٧- هوٚنراوەکانم بە بیـرهاتنەوە.

ب:

١- ئەڤان خەباتکەران ئالایێ کوردستانیٚ بلندکر.

٢- حکومەتـا کوردستانیٚ لە شکریٚ خوٚ بهیٚزکر.

٣- شڤانی هەڤالیٚن خوٚ دلخوٚش کرن.

٤- پەیمانەکەیـان نوٚی کردەوە.

٥- مروٚڤەکە بە ئـاگا هاتەوە.

٦- نووسەرەکە دلشـاد بووەوە.

پ:

١- بەرهەمیٚ کـارگەهیٚ زوٚرکر.

٢- ئـاستیٚ زانستیٚ پیٚش ڤە چوو.

٣- نەخویندەڤانی ژنـاڤ چوو.

ت:

١- پاپۆر دئاڤێدا نقوم بوو.

٢- مرۆڤە هەژارەکە پەکی کەوت.

٣- نارینێ کەل و پەلێن شکەستی فرێدان.

## بەرچاڤکرن:

بەری نهۆ مە زانی کو چاوگ سەرەکانیا کارییە، واتە کار ژ چاوگی دهێتە دروستکرن، ب لابرنا پیتا (ن)ا چاوگی، کارێ لێکدای ژ چاوگێ لێکدای دهێتە دروست کرن، چاوگێ لێکدای ژی وەکی ل پێشتر مە خواندی ژ چاوگێ سادە یان یێ داریژتی دگەل پەیڤەکا واتادار یان پتر پێك دهێت.

ئـ: ئەگەر تەماشەی ڕستەیێن پشکا (ئـ) بکەین، دێ بینین د هەر ڕستەیەکێدا کارەکێ لێکدای هەیە کو ژ چاوگەکێ لێکدای هاتییە وەرگرتن، ب ئەڤی ڕەنگێ ل خوارێ:

١- د ڕستەیا ئێکێدا کارێ (خەلاتکر) کارەکێ لێکدایە ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ(خەلاتکرن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ ناڤەکێ سادە و ژ چاوگەکێ سادە پێکهاتییە(خەلات+کرن).

٢- د ڕستەیا دوویێدا کارێ (سەرادا) کارەکێ لێکدایە ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ(سەرەدان) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ ناڤەکێ داریژتی و چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (سەرە + دان).

٣- د ڕستەیا سێییێدا کارێ (نالە نالەکر) کارەکێ لێکدایە ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ (نالە نالەکرن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ ناڤەکێ لێکدای و چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (نالە نالە+کرن).

٤- د ڕستەیا چواریێدا کاریێ (دەست پێکر) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (دەست پێکر) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ پەیڤەکا سادە و چاوگەکێ داریژتی پێکهاتییە (دەست + پێکرن).

٥- دڕستەیا پێنجێدا کاریێ (لەیادکرد) کارەکێ لێکدایە ژدوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە،کو ژ چاوگێ لێکدای (لەیادکردن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ پەیڤەکا داریژتی و چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (لەیاد + کردن).

٦- د ڕستەیا شەشێدا کاریێ (ژ بیرکر) کارەکێ لێکدایە ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (ژ بیرکرن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ ناڤەکێ داریژتی و چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (ژبیر + کرن).

٧- د ڕستەیا حەفتێدا کاریێ (بەبیرهاتەوە) کارەکێ لێکدایە ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (بەبیرهاتنەوە) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ ناڤەکێ داریژتی و چاوگەکێ داریژتی پێکهاتییە (بەبیر + هاتنەوە).

ب-

دەمێ تەماشەی ڕستەییێن پشکا (ب) دکەین، دێ بینین دهەر ڕستەیەکێدا کارەکێ لێکدای هەیە، کو ژ چاوگەکێ لێکدای هاتییە دروست کرن، ب ئەڤێ رەنگێ ل خواریێ:

١- د ڕستەیا ئێکێدا کاریێ (بلندکر) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (بلندکرن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤاڵناڤێ سادە و چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (بلند + کرن).

٢- د ڕستەیا دوویێدا کاریٚ (بهێزکر) کارەکیٚ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگیٚ لێکدای (بهێزکرن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤاڵناڤیٚ دارێژتی و چاوگەکیٚ سادە پێکهاتییە (بهێز + کرن).

٣- د ڕستەیا سێیێدا کاریٚ (دلخۆش کر) کارەکیٚ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگیٚ لێکدای (دلخۆش کرن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤاڵناڤیٚ لێکدای و چاوگەکیٚ سادە پێکهاتییە (دلخۆش + کرن).

٤- د ڕستەیا چوارێدا کاریٚ (نوێ کردەوە) کارەکیٚ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگیٚ لێکدای (نوێ کردنەوە) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤاڵناڤەکیٚ سادە و چاوگەکیٚ دارێژتی پێکهاتییە (نویٚ + کردنەوە).

٥- د ڕستەیا پێنجێدا کاریٚ (بە ئاگا هاتەوە) کارەکیٚ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگیٚ (بە ئاگا هاتنەوە) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤاڵناڤەکیٚ دارێژتی و چاوگەکیٚ دارێژتی پێکهاتییە (بەئاگا + هاتنەوە).

٦- د ڕستەیا شەشێدا کاریٚ (دلشاد بووەوە) کارەکیٚ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگیٚ (دلشاد بوونەوە) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤاڵناڤەکیٚ لێکدای و چاوگەکیٚ دارێژتی پێکهاتییە (دلشاد + بوونەوە).

پ-

دیسان ئەگەر تەماشەی ڕستەیێن پشکا (پ) بکەین، دیٚ بینین کارێن لێکدای تێدا هەنە، ب ئەڤی ڕەنگیٚ ل خواریٚ:

١- د ڕستەیا ئێکێدا کارێ (زۆرکر) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پێکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (زۆرکرن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤالکارەکێ سادە و چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (زۆر + کرن).

٢- د ڕستەیا دوویێدا کارێ (پێش ڤەچوو) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پێکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (پێش ڤەچوون) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤالکارەکێ سادە و چاوگەکێ دارێژتی پێکهاتییە (پێش + ڤەچوون).

٣- د ڕستەیا سێییێدا کارێ (ژناڤ چوو) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤێن واتادار پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (ژناڤ چوون) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ هەڤالکارەکێ دارێژتی و چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (ژناڤ + چوون).

ت- دیسان ئەگەر تەماشەی ڕستەییێن پشکا (ت) بکەین دێ بینین کارێن لیکدای تێدا هەنە، ب ئەڤی رەنگێ ل خوارێ:

١- د ڕستەیا ئێکێدا کارێ (نقووم بوو) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤان پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ لێکدای (نقووم بوون) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ پەیڤا (نقووم) کو ئەڤرۆ چ رامانانێن سەربەخۆ نادەت دگەل چاوگێ (بوون) پێکهاتییە (نقووم + بوون).

٢- د ڕستەیا دوویێدا کارێ (پەککەوت) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤان پیکهاتییە، ژ چاوگێ(پەککەوتن) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ پەیڤا (پەك) کو ئەڤرۆ چ رامانانێن سەربەخۆ نادەت دگەل چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (پەك + کەوتن).

٣- د ڕستەیا سێییێدا کارێ (فرێدا) کارەکێ لێکدایە، ژ دوو پەیڤان پیکهاتییە، کو ژ چاوگێ(فرێدان) هاتییە وەرگرتن، ئەڤ چاوگە ژ پەیڤا (فرێ) کو چ رامانانێن سەربەخۆ نادەت دگەل چاوگەکێ سادە پێکهاتییە (فرێ + دان).

## دەستـــوور:

**کارێ لێکدای**: ئەو کارە یێ کو ژ چاوگەکێ لێکدای دروست دبیت و دناڤ ڕستەیێدا وەکو پەیڤا سەربەخۆ ئەرکێ خۆ دبینیت، چاوگێ لێکدای ژ دوو پەیڤێن واتادار یان پتر پێك دهێت ب ڤی رەنگێ ل خوارێ:-

ئـ- ناڤ + چاوگ

١- ( ناڤێ سادە + چاوگێ سادە ) وەکو ( دەست گرتن، رێز بوون، یارمەتی دان، ئاڤـدان، سواربوون، سوارکرن، بانگ کردن ... )

٢- ( ناڤێ دارێژتی ب پاشگری + چاوگێ سادە ) وەکو ( ڕێگا گرتن، گەرما بوون ).

٣- ( ناڤێ لێکدای + چاوگێ سادە ) وەکو ( ناڵە ناڵەکردن، ماڵئاوایی کردن ).

٤- ( نـاڤێ سـادە + چـاوگێ دارێـژتی ) وەکـو ( دەسـت هەڵبـڕین، چاولێبوون، چـاڤ پێکەفتن، دەست ڤەکرن، دەست پێ کرن ).

٥- ( نـاڤێ دارێـژتی ب پێشـگری + چـاوگێ سـادە ) وەکـو ( لـە هـۆش چـوون، ژبیـر چوون، لەبیـرکردن، ب دەست ئینان ).

٦- ( ناڤێ دارێژتی + چاوگێ دارێـژتی ) وەکـو ( بەبیـرهاتنەوە، لـە یـاد دچـوونەوە، بەبیـرهێناوە ).

ب/ هەڤاڵناڤ + چاوگ

١- ( هەڤاڵناڤێ سادە + چاوگێ سادە ) وەکو ( بلندکرن، خۆش کردن، گەش کرن، گەرم بوون، پر بوون، پڕکرن ).

٢- ( هەڤاڵناڤێ دارێژتی + چاوگێ سادە ) وەکو ( بهێزکرن، بەهێزکردن، نەخۆش کەوتن ).

٣- ( هـەڤاڵناڤێ لێکـدای + چـاوگێ سـادە ) وەکـو ( دلخـۆش کـرن، ڕوو ڕەش کـرن، دلشاد بوون ).

٤- ( هەڤالناڤێ سادە + چاوگێ دارێژتی ) وەکو ( نوی کردنەوە ، تیژ کردنەوە، شین بوونەوە ).

٥- ( هەڤالناڤێ دارێژتی + چاوگێ دارێژتی ) وەکو ( بەئاگا هاتنەوە ، بەهێز بوونەوە ).

٦- ( هەڤالناڤێ لێکدای + چاوگێ دارێژتی ) وەکو ( دل سارکردنەوە، دلخۆش کردنەوە ).

پ: هەڤالکار + چاوگ

١- ( هەڤالکارێ سادە + چاوگێ سادە ) وەکو ( زۆر کرن، کەم کردن، کێم بوون ).

٢- ( هەڤالکارێ دارێژتی + چاوگێ سادە ) وەکو ( ژناڤ چوون، لەناوبردن، ژ ناڤ برن ).

٣- ( هەڤالکارێ سادە + چاوگێ دارێژتی ) وەکو ( زۆر کردنەوە، کەم کردنەوە، پێش ڤەچوون ).

ت: پەیڤەك کو رامانا خۆ یا سەربەخۆ نەبیت + چاوگێ سادە، وەکو:-

( نقووم بوون ، وازهێنان ، پەککەوتن ، فرێدان ، هاندان ، فێربوون )

## ڕاهێنان ( ١ )

کارێ لێکدای ب چەند ڕێکا دروست دبیت، بۆ هەر ڕێکەکێ دوو نموونەیان بینە، ودڕستەیاندا بکاربینە.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ژ ئەڤان کارێن ل خوارێ کارێ لێکدای دروست بکە، و دڕستەیاندا بکاربینە، و چەوایيا دروست بوونا وان روون بکە.

(کەفت ، دا ، بوو ، کردەوە ، گرت)

## ڕاهێـنـان (٣)

ژ ئـەڤان مـالـكێن هۆزانا هـەر چ كـارەكێ لێكدای تێدا هـەبیت دەستنیشـان بكە، وچەواییا دروست بوونێ ژی بنڤیسە:-

١- بەند و زنجیـر دێ ڤەبن جەرحێن دكول دێ خۆش بكت
لـەو كـو نـاڤێ دلـبـەرێ دەرمـانـێ دەردێ بـەنـدەیـە (جزیری)

٢- ئەو كەسەی گیانی لـە ڕێگەی نیشتمانا بەخت ئەكا
پێی مەڵێن مردووە، شەهیدە وا لە فیردەوسی بەرین (بێكەس)

٣- غونچە لە با ژ ڕەنگ گولێ دێمێ ب سەر نوما مەلێ
شوبهەتی بولبولان سەمەر لـەو مەفغان و نـالـەكر (جزیری)

٤- داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەرناگرێ
سەربـەخـۆیی بـێ فیداكـاری ئـەبـەد سـەرنـاگرێ (بێكەس)

٥- چیمەنێ دێمێ تەگەش بوو نوی بەهارە ڕست و خـۆش بوو
كـەسك و سـۆرە پڕ لـە نوورە سوبح و شام لێ كەت خوناڤ
بـەژن و بـالا یـاسـەمین بـوو، بـاغـێ زولفا تـازە شیـن بوو
ژ وان دبـاریت شیرو شـەكـر و عـەنبـەر و مـسـك و گـولاڤ

## ڕاهێـنـان (٤)

ئەڤان ڕستەیـان شـرۆڤە بكـە:

١- ڤی خەباتكەری دێ خەلاتكەین.

٢- ئەزێ خانی ئاڤادكەم.

# کاریٚ تێنەپەڕ وکاریٚ تێپەڕ

(ئـ)

١- زاروٚك نڤست. زاروٚك دیٚ نڤیت.

٢- دوهی چوومە بازاری. سوباهی دیٚ چمە بازاری.

٣- ڤیان ڤەگەڕیا ڤیان دیٚ ڤەگەڕییێت

(بـ)

١- ئالانی پەنجەر دائێخست. ئالان دیٚ پەنجەریٚ دائێخیت.

٢- ئەڤینیٚ نان خوار. ئەڤین دیٚ نانی خوٚت.

٣- نڤیسەری چیروٚك نڤیسی. نڤێسەر دیٚ چیروٚکیٚ نڤیسیت.

کار پەیڤەکە کریارەکیٚ یان رەوشا کەسەکی یان تشتەکی بەحس دکەت د دەمەکیٚ دەست نیشانکری دا، کاریٚ تێنەپەر ئەو کارە یێ ئەرکیٚ وی ژ بکەری دەرباز نەبیت سەر چ کەس و تشتان و هەر ب تنیٚ واتاو رامانا خوٚ ب تمامی ددەت.

١- ئەگەر سەرنجیٚ ل ڕستەیێن پشکا (ئـ) بدەین، ئەو راستی دیٚ بوٚمە دەرکەڤیت، بوٚ نموونە دڕستەیا ئیکێدا کاریٚ (نڤست – دی نڤیت) بێی هاریکاریا چ پەیڤێن دی ئیکسەر ڕامانا ڕستەییٚ دەرئێخستییە و بوویە کاریٚ ڕستەییٚ کو بکەری ئەنجامدایە و ئەرکیٚ کاری ژ بکەری دەرباز نەبوویە سەر کەسەکی یان تشتەکیٚ دی، هەر وەسان کارێن ڕستەیێن دوویٚ و سێییٚ ژی (چووم – دیٚ چم) (ڤەگەڕیا – دیٚ ڤەگەڕییێت) د جهێن خوٚدا کارێن تێنەپەڕن.

٢- لـىٚ د ڕسـتـەيێن پشـكا (ب) دا كـارێن (دائێخسـت - دێ دائێخيـت) (خـوار - دێ خـوٚت) ( نڤيسـى - دێ نڤيسـيت) بتنـێ رامانا تـمـام يـا ڕستـەيان نـادەن، بـوٚ نموونـە دەمـێ دبێـژين (ئـالانى دائێخسـت) يـان (ئـالان دێ دائێخيـت) ڕامانـا تـمـام نينـە، و ئـەڤ كـارە پێـدڤى ب پەيڤـەكا دى هەيـە دا رامانـا رستـێ تـمـام بيـت كـو دبێـژنێ (بـەركار). د ڕستەيێدا ديار دبيت كـو (ئالانى) (پەنجـەر) يا دائيخستى و ئانكو بكـەر يـێ ژ كـارى دەربازدبيـت و بـەركارى وەردگريـت داكـو رامـانـا رسـتـێ ب تـمـامى بگەهيتـە گوهـدارى، ودبيژينـە ڤـان جـوٚرە كـاران (تێپـەڕ). ب هـەمان رەنـگ دڕسـتـەيێن دى ژيـدا پـەيڤێن (نـان ، چيـروٚك) دبنە بەركار و واتايا (كار)ى تمام دكەن

**دەسـتـوور:**

كارێ تێنەپەڕ كارەكە كريارەكێ يان كەسەكى يـان تشـتەكى نيشـاددەت ددەمـەكێ دياركريدا و هەر بتنێ رامانا تمام ددەت و ئەركێ وى پەيوەنديا ب بكەرى ڤە هەى.
كـارێ تێپـەڕ كارەكـە كريـارەكێ يـان كەسـەكى يـان تشـتەكى نيشـاددەت ددەمـەكێ دياركريدا و هەردەم ئەڤ كريارە ژ بكەرى دەرباز دبيت بوٚ سەر كەسـەكى يـان تشـتەكێ دى كو دبێژنێ ( بەركار).

## ڕاهێنان (١)

ژ ئەڤان کارێن ل خوارێ کارێ تێپەڕ و کارێ تێنەپەر ژێك جودا بکە، وکارێن تێپەڕ دڕستەیاندا بکاربینە:-

(کەوتبوو ، دنڤیسیت ، دێ فڕیت ، هەلگرتییە ، ڕاخست، چوو ،نووست)

## ڕاهێنان (٢)

ئەڤان پەیڤان دڕستەیاندا بکاربینە ب مەرجەکی جارەکێ ببنە بکەر و جارەکێ ببنە بەرکار:-

(کۆتر ، گول ، دیوار ، پیاو)

## ڕاهێنان (٣)

ژ ئەڤان پارچە هۆزانا کارێ تێپەر و تێنەپەڕ دەربینە:-

١- زینێ ل بەر ئاڤا ئەڤینێ ڕوینشت
کۆتر هیڤی یان وێ نەڤە کوشت
گوت مەم هەر هاتیە و نابت نەئێت
عشق من گولاڤ دێ ژ بەری زێت

(بدرخان سندی)

٢- گڵۆپەکانی سەر جادە و کۆڵان
زەرد هەڵگەڕا بوون کزکز ئەسووتان
ئاسمانی شین و ئەستێرەکانی
پێدەکەنین بۆ بەری بەیانی

(گۆران)

## ڕاهێـنـان (٤)

جیـاوازی دناڤبـەرا کـاریٛ تێنەپـەڕ وکـاریٛ تێپـەڕدا چـییە؟ ڕوون بکـە ب نموونەڤە.

## ڕاهێـنـان (٥)

**شــرۆڤەکرن:**

١- باران باری.

باران: ناڤە، سادەیە، بکەرە، بەرجەستەیە.

باری: کـاریٛ بۆریێ نزیکە، تێنـەپـەڕە.

٢- ئەڤان ڕستەیان شـرۆڤە بکە:

ئ- ئاشەڤان گەنمی دهێریت.

ب- کیڤریشك ژ تراشیٛ دەرکەڤت.

پ- ئاسنگەر شالۆکان دروست دکەت.

ت- زارۆك د جولانکێدا نڤستییە.

# گوهۆڕینا كارێ تێنەپەڕ بۆ كـارێ تێپەڕ

١-

| | |
|---|---|
| ئـ- نامە گەهشت | ئەوان نامە گەهاند |
| زارۆك نڤست | ئەوێ زارۆك نڤاند |
| لەشكرێ دوژمنی بەزی | ئەوان لەشكرێ دوژمنی بەزاند |

ب-

| | |
|---|---|
| ترومبێل راوەستا | ڕێبوارێ ترومبیل راوەستاند |
| سیپان ترسا | ئەوان سیپان ترساند |
| نەخـۆش رازا | نوژدارێ نەخۆش رازاند |

| | |
|---|---|
| ٢- نەخۆشەكە نالاندی | نـەخۆشەكەی هێنایە نالاندن |
| بـەرخـەكە باڕاندی | بەرخەكەیان هێنایە باڕاندن |
| گـایـەك بـۆڕانـدی | گـایـەكـەی هێنـایـە بۆڕاندن |

**بەرچـاڤـكـرن:**

١- دەمێ سەحا ڕستەیێن لایێ دەستێ راستێ پشكا ژمارە (١ ⟵ئـ ، ب) دكـەین، دێ بیـنین كـۆ كـارێ (گەهشـت، نڤسـت، بـەزی، راوەسـتا، ترسـا، رازا) دڕسـتەیاندا هاتینـە بكارئینـان، هـەر ئێـك ژڤـان كـاران د جهـێ خـۆدا كـارەكێ تێنەپـەڕە چونكو كـارێ كەسـەكی یـان تشـتەكی دەرئێخستییە د دەمەكێ دیاركریدا.

هەروەسا كاریگەریا وی كاری ژ بكەری تێنەپەڕیـە (دەربازنەبوویـە) ئانكو تنێ بكەر وەرگرتییە و ڕامانەكا تەمام دایە دەست.

بەلێ دەمێ سەحا ڕستەییێن دەستێ چەپێ پشکا ( ١ ← ئـ ، ب) دکەین، دێ بینین کو کارێ (گەهاند، نڤاند، بەزاند، ڕاوەستاندن، ترساند، رازاند) د ڕستەیاندا هاتینە بکارئینان. هەر ئێك ژڤان کاران د جهێ خۆدا کارەکێ تێپەڕە، چونکو کاریگەریا وی ژ بکەری تێپەڕیە (دەربازبوویە) کەفتیە سەر بەرکاری، ئانکو ژبلی بکەری پێدڤی ب بەرکاری هەیە دا رامانەکا تەمام بدەت.

ئەڤجا ل دەمێ گوهۆڕینا کارێ تێنەپەڕ بۆ کارێ تێپەڕ مە پێدڤی ب ڕەگێ کاری یان قەدێ چاوگی (بناغێ چاوگ)ی هەیە و دێ پاشگرێ (اندن) ئێخینە سەر رەگێ کاری یان قەدێ چاوگی، چاوگەکێ تێپەر دێ دروست بیت. ئەم دشێین ژ چاوگێ نوی کارێ رابردوو، رانەبردوو، داخوازی دروست بکەین لدویف وان دەستوورا ئەوێن بەری نوکە مە خواندین، چاوگێ تێنەپەڕ ب ڤی شێوەی دێ هێتە گوهورین بۆ چاوگێ تێپەڕ:

١- ئـ

| چاوگێ تێنەپەڕ | ڕەگێ کار | پاشگر | چاوگێ تێپەڕ |
|---|---|---|---|
| گەهشتن | گەه | اندن | گەهاندن |
| نڤستن | نڤ | اندن | نڤاندن |
| بەزین | بەز | اندن | بەزاندن |
| مرن (مردن) | مر | اندن | مراندن |
| زڤڕین | زڤڕ | اندن | زڤڕاندن |
| کەلین | کەل | اندن | کەلاندن |

ب-

| چاوگێ تێنەپەڕ | قەدێ چاوگ | پاشگر | چاوگێ تێپەڕ |
|---|---|---|---|
| گریان | گریا | اندن | گریاندن |
| ترسان | ترسا | اندن | ترساندن |
| ڕاوەستان | ڕاوەستا | اندن | ڕاوەستاندن |
| ڕازان | ڕازا | اندن | ڕازاندن |
| ئێشان | ئێشا | اندن | ئێشاندن |

٢- د زارێ کرمانجییا خارێدا هندەك چاوگێن تێنەپەر هەنە کو ژ دەنگێن سروشتی دهێنە دروستکرن ب هاریکاریا پاشگرێ (اندن)، دەمێ سەحا ڕستەیێن لایێ چەپێ ژ پشکا ژمارە (٢ - ب) دکەین، دێ بینین کو (نالاندن، باڕاندن، بۆڕاندن) چاوگن، ئەڤ چاوگە هەر چەندە ژ دەنگێ سروشتی و پاشگرێ (اندن) هاتینە دروستکرن، بەلێ هەر تێنەپەرن، ئەڤ چاوگە لدویڤ دەستوورێ بەری نوکە مە ئاماژە پێدای و ب هاریکاریا پاشگرێ (اندن) نابنە چاوگێ تێپەڕ. بەلکی ب هاریکاریا کارێ یاریدەر (هێنایە) یان (دهێنێتە) کو دکەڤنە پێش چاوگێ تێنەپەڕ چاوگێ تێپەڕ و ب ڤی شێوەی:

| دەنگێ سروشتی | پاشگر | چاوگێ تێنەپەر | کارێ یاریدەدەر | چاوگێ تێپەر |
|---|---|---|---|---|
| نالە | اندن | نالاندن | هێنایە | هێنایە نالاندن |
| بارە | اندن | باراندن | هێنایە | هێنایە باڕاندن |
| بۆڕە | اندن | بۆڕاندن | هێنایە | هێنایە بۆڕاندن |
| قیژە | اندن | قیژاندن | هێنایە | دهێنێتە قیژاندن |

**ڕوونکرن:**

هەکە ڕەگێ کاری یان قەدێ چاوگی یان دەنگێ سروشتی ب پیتەکا بزوێن بدوماهی هات، دێ پیتەکا نەبزوێن لێ زێدەکەین یان دێ وێ پیتا بزوێن ڕاکەین، چونکو دوو پیتێن بزوێن لدویڤ ئێك ناهێن.

**دەستـــوور:**

گوهۆڕینا کارێ تێنەپڕ بۆ کارێ تێپەڕ

١-

ئـ- (ڕەگێ کاری + اندن) = چاوگێ تێپەڕ

ب- (قەدێ چاوگی + اندن) = چاوگێ تێپەڕ

پ- کارێ یاریدەدەر (هێنایە)+ دەنگێ سروشتی+ اندن= چاوگێ تێپەڕ

## ڕاهێنـان (١)

چەوا دێ کارێ تێنەپەڕ و کارێ تێپەڕ ژێك جودا کەین؟ ب نموونە ڤە ڕوون بکە:

## ڕاهێنـان (٢)

ب چەند ڕێکا کارێ تێنەپەڕ دهێتە گوهوڕین بۆ کارێ تێپەڕ؟ ب نموونە ڤە ڕوون بکە:

## ڕاهێنان (٣)

چەوا ژ دەنگێن سروشتی کاریْ تێپەڕ دهێتە دروستکرن؟ ب چەند پێنگاڤا! ب نموونە ڤە ڕوون بکە:

## ڕاهێنان (٤)

ئەڤان کارێن تێنەپەڕ بگوڕە بوْ کاریْ تێپەڕ و د ڕستەکێدا بکاربینە:

(تێپەڕی، خشیا، برژا، خەندقی، سووتا، وەری، ڕەڤی، هەرمی، ڤەمری، هەڕفت، ڤەبریا، ئازریا).

## ڕاهێنان (٥)

ئەڤان ڕستەیێن ل خاریْ شروْڤەبکە:

١- پێشمەرگێ کوردستانیْ لەشکریْ دوژمنی بەزاند.

٢- شێرزادی و هەڤالێن خوْ دەمەکیْ خوْش بوْراند.

## هەڤاڵکارێ چەوایی

١- من دەرگەهـ باش داخستییە.

٢- مە وانە بلەز نڤیسی.

٣- مللەتێ کورد شێرانە ل بهارا سالا ١٩٩١ سەرهلدا.

٤- نێچیرڤان ب سیاری چوو بۆ نێچیرێ.

٥- ئەم ب سەربەرزی دژین.

### بەرچاڤکرن:

هەکە پرسیاربکەین من چەوا دەرگەهـ داخستییە؟ یان مە وانەیا خو چەوا نڤیسی؟ یان مللەتێ کورد چەوا سەرهلدا؟ یان نێچیرڤان چەوا چوو بو نێچیرێ؟ یان ئەم چەوا دژین؟

دێ بینین کو د بەرسڤا پرسیارا ڕستەیا ئێکێدا (باش) یا دووێ (بلەز) یا سێیێ (شێرانە) یا چوارێ (ب سیاری) یا پێنجێ (ب سەربەرزی).

هەر ئێك ل جهێ خۆدا وەك هەڤالکارەکی وەسفا چەوایی یا رویدانا ڕستەیێن خۆ دکەن و دبنە تەمامکەرێ رامانا کارێن خۆ. ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنە هەر ئێکی ژ وان (هەڤالکارێ چەوایی)هەڤالکارێ چەوایی ژ لایێ پێکهاتنێڤە سێ جۆرە:-

١- سادە: ژ پەیڤەکا سەربخۆ پێك دهێت: (لەز، باش، هێدی، پاك، چاك، ئازا ......).

٢- دارِشتی: ژ پەیڤەکا سادە و زێدەهیەکێ پێک دهێت، زێدەهی ژی یان پێشگرە یان پاشگرە یان هەردووک پێکڤەنە وەك (ب لەز، ب سیاری، شێرانە، ب باشی، ب ئازادی ......).

٣- لێکدای: ژ دوو پەیڤان یان پتر پێك دهێت وەك (ب دلمانی، پشت و پشت، سەربەرزانە، ب دلسۆزی.....) هەکە ( باش، چاك، خراب، پاك، قەنج) وەسفا ناڤەکی یان جێناڤەکی بکەت، دێ بنە هەڤاڵناڤ و نابنە هەڤاڵکار وەك (چرایەکێ باش ژ دەهێن خراب چاکترە) د ڤێ رِستەییدا، پەیڤێن (باش، خراب، چاکتر) هەڤاڵناڤن چونکو پەسنا ناڤەکی دکەن، هەر چەندە پەیڤا (چاکتر) دبیتە تەمامکەرێ کارێ بێهێز و وەسفا نیهادی دکەت کو چرایە.

هەڤاڵکارێ چەوایی یێ سادە، وەك پەیڤەك دبیتە تەمامکەرێ رامانا کارێ رِستەیێ و بۆ ڤێ تەمامکەرنێ پێدڤی ب ئامرازێ تەمامکرنێ نینە، بەلێ هەڤالکارێ چەوایی یێ دارشتی و لێکدای وەك گرێیەکا هەڤالکارێ چەوایی دبنە تەمامکەرێ کارێ رِستەیێن خۆ.

**دەستوور:**

**هەڤاڵکارێ چەوایی دناڤ رِستەییدا ( پەیڤەکە، یان گرێیەکا هەڤاڵکاری )یە چەوایی یا رِویدانا کارێ رِستەیێ دیاردکەت و ژ ڤی لایڤە دی بیتە تەمامکەرێ رامانا کاری.**

**پەیڤێن ( باشی، خراب، پاك، قەنج، زۆر، کێم ..... ) هەکە وەسفا ناڤەکی یان جێناڤەکی بکەن، دێ بنە هەڤاڵناڤ بەلێ هەکە چەوایی یا رِویدانا کارەکی دیاربکەن دی بنە هەڤاڵکارێ چەوایی.**

## ڕاهێنان (١)

ئەڤان پەیڤێن ل خارێ دڕستەکێدا بکاربینە ب مەرجەکی جارەکێ ببنە هەڤاڵناڤ و جارەکێ ژی ببنە هەڤاڵکارێ چەوایی؟

(ب دلسوزی ، خراب ، ب سەربەستی ، زوّر ، بلەز ، هێدی)

## ڕاهێنان (٢)

ئەڤان پەیڤێن سادە ل خارێ بکە هەڤالکارێ چەواییێ دارێژتی:

(هێمن ، سار ، خوّش ، زیرەك ، پاك ، مەرد ، تاڵ ، چاك)

## ڕاهێنان (٣)

**شـروّڤە کرن:**

١- من روّژنامە بلەز خواند.

من: جێناڤێ کەسییێ جودایە، بوّ کەسێ ئێکێ یێ تاك، بکەرە.

روژنامە: ناڤە، تاکە، نەناسیارە، گشتییە، بەرکارە.

بلەز: هەڤاڵکارێ چەواییێ دارشتییە تەمامکەرێ رامانا کارێ خواندە.

خواند: کارێ رابردوویێ تێپەرە.

٢- ڤان ڕستەیان شروّڤە بکە:

ئ - خوارنێ ب گەرمی نەخوّ.

ب- قوتابییێ ژیر، ژیرانە بەرسڤێ ددەت.

پ- ئەم ب دلسوّزی کار دکەین.

# کاریّ یاریدەر (هاریکار)

ڤان ڕستەیان بخوینە:

١- ڤیابا ئەوان کاریّ خوّ تەمام کربا.

٢- ئەز دکارم ئەرکیّ خوّ بجە بینم.

٣- دڤیّت ویّ چیروکیّ بخوینم.

٤- پەرتووکا زمان و ئەدەبیّ کوردی هاتە چاپکرن.

٥- ئەڤ گوندە دیّ هیّتە ئاڤاکرن.

٦- من دڤیّت زوو ژ خەو رابم.

٧- ئەم دشیّین بسەر چیا بکەڤین.

٨- ئەز دویّرم ژ رووباری دەربازبم.

٩- دبیت ئەڤروّ ماموّستا نەهیّت.

١٠- جوتیاری زەڤی دا کیّلان.

١١- دیلانیّ نەڤیّت فیّرببیتە زمانیّ فرەنسی.

١٢- چیّدبیت دلوّڤان ییّ نەخوّش بیت.

١٣- من خانی دابوو ئاڤاکرن.

## بەرچاڤـكـرن:

بەری نوکە مە زانیبوو کو کاریّ (ڤیابا، بوو، دڤێت، هاتە، دیّ هێتە، دشێین، دویّرم، دبیت، دا، نەڤێت، چێدبیت)
هەر ئێك کارەکیّ رامانداریّ سەربخۆنە، چێدبیت هەر ئێك ژوان ب تنیّ دناڤ ڕستەییێدا وەك: کارەکیّ سەربخۆییّ تمام بهێتە بکارئینان و ئەرکیّ خۆ ببینیت.
بەلێ دگەل ویّ چەندیّ ژی چێدبیت کارێن ناڤبری وەك کارەکیّ یاریدەدەر دناڤ ڕستەییێدا بهێنە بکارئینان، دەمیّ دگەل کارەکیّ سەرەکی یێ سەربخۆ یان دگەل چاوگەکی دهێن، کو هەر ئێك بۆ مەرەمەکێیە. بۆ نموونە:

١- د ڕستەیا ئێکێدا کاریّ (ڤیابا) کارەکیّ یاریدەدەرە، کو بۆ مەرەما پێدڤی بکارهاتییە، کاریّ (تەواوکربا) کارەکیّ سەرەکییە د ڕستەییێدا و مەرەم و رامانا ڕستەییّ ب هاریکاریا کاریّ (ڤیابا) ب دروستی ئاشکەراکریە.

٢- د ڕستەیا دوویێدا کاریّ (دکارم) کارەکیّ یاریدەدەرە، بۆ مەرەما دیارکرنا شیانا بجە ئینانا کاری بکارهاتییە. بەلێ کاریّ (بجە بینم) کارەکیّ سەرەکییە دڕستەییێدا و ب هاریکاریا کاریّ یاریدەدەر (دکارم) مەرەم و رامانا ڕستەییّ ب دروستی دایە دەست.

٣- د ڕستەیا سێییێدا کاریّ (دڤێت) کارەکیّ یاریدەدەرە، کو بۆ مەرەما پێدڤی بکارهاتییە، بەلێ کاریّ (بخوینم) کارەکیّ سەرەکییە

د ڕستەییێدا و ب هاریکاریا کاریٚ یاریدەدەر (دڤێت) مەرەم و ڕامانا ڕستەییٚ ب دروستی دیارکریە.

٤- د ڕستەیا چوارێدا کاریٚ (هاتە) کارەکیٚ یاریدەدەرە، بەلیٚ چاوگیٚ (چاپکرن) ل جهیٚ کاریٚ سەرەکی هاتییە و جهیٚ وی گرتییە وب هاریکارییا کاریٚ یاریدەدەر(هاتە)رامانا ڕستەییٚ ب دروستی دیارکریە.

٥- د ڕستەیا پێنجێدا کاریٚ (دیٚ هێتە) کارەکیٚ یاریدەدەرە، چاوگیٚ (ئاڤاکرن) کو ل جهیٚ کاریٚ سەرەکی بکارهاتییە و ب هاریکاریا کاریٚ یاریدەدەر (دیٚ هێتە) رامانا ڕستەییٚ ب روستیٚ دایە دەست.

٦- د ڕستەیا شەشێدا کاریٚ (دڤێت) کارەکیٚ یاریدەدەرە، بوٚ مەرەما ڤیانیٚ بکارهاتییە، کاری (رابم - رابـبم) کارەکیٚ سەرەکییە و ب هاریکاریا کاریٚ یاریدەدەر (دڤێت) رامانا ڕستەییٚ ب دروستی ئاشکەرا دکەت.

٧- د ڕستەیا حەفتێدا کاریٚ (دشێین) کارەکیٚ یاریدەدەرە، بوٚ مەرەما شیانیٚ بکارهاتییە، بەلیٚ کاریٚ (سەربکەڤین) کارەکیٚ سەرەکییە و ب هاریکاریا کاریٚ یاریدەدەر (دشێین) رامانا ڕستەییٚ ب دروستی دەردئێخیت.

٨- د ڕستەیا هەشتێدا کاریٚ (دوێرم) کارەکیٚ یاریدەدەرە، بوٚ مەرەما وێران و ئازایەتییٚ بکارهاتییە. بەلیٚ کاریٚ (دەربازبم) کارەکیٚ سەرەکییە و ب هاریکاریا کاریٚ یاریدەدەر (دوێرم) رامانا ڕستەیی ب دروستی ڕوون و ئاشکەرا دکەت.

٩- درستەیا نەهێدا کارێ (دبیت) کارەکێ یاریدەدەرە و کارێ (نەهێت) کارەکێ سەرەکییە و ب هاریکاریا کارێ یاریدەدەر (دبیت) رامانا رستەیێ ب دروستی دیارکریە.

١٠- د رستەیا دەهێدا کارێ (دا) کارەکێ یاریدەدەرە، چاوگێ (کێلان) ل جهێ کارێ سەرەکی بکارهاتییە وجهێ وی گرتییە، ب هاریکاریا کارێ یاریدەدەر (دا) رامانا رستەیێ ب دروستی دیارکریە.

١١- د رستەیا یازدێدا کارێ (نەڤێت) کارەکێ یاریدەدەرە بۆ مەرەما نەڤیانێ بکارهاتییە، بەلێ کارێ (فێربیت) کارەکێ سەرەکییە و ب هاریکاریا کارێ یاریدەدەر (نەڤێت) رامانا رستەیێ ب دروستی روون و ئاشکەرا دکەت.

١٢- د رستەیا دوازدێدا کارێ (چێدبیت) کارەکێ یاریدەدەرە، بۆ مەرەما چێبوونێ بکارهاتییە و کارێ (بیت) کارەکێ سەرەکییە و ب هاریکاریا کارێ یاریدەدەر (چێدبیت) رامانا رستەیێ ب دروستی دیار کریە.

١٣- د رستەیا سێزدێدا کارێ (دابوو) کارەکێ یاریدەدەرە، چاوگێ (ئاڤاکرن) ل جهێ کارێ سەرەکی بکارهاتییە و جهێ وی گرتییە و ب هاریکاریا کارێ یاریدەدەر (دابوو) رامانا رستەیێ ب دروستی دایە دەست.

**دەستوور:**

**کاریێ یاریدەدەر: ئەو کارە یێ کو دگەل کارەکێ سەرەکی یێ سەربەخۆ یان چاوگەکێ دهێت، بۆ دیارکرنا مەرەمەکێ و دبیتە ئەگەرێ تەمامکرنا رامانا وی کاری یان وی چاوگی.**

**کارێن یاریدەدەر ئەڤەنە ( ڤیابا ، دڤێت ، هاتە ، دێ هێتە ، د شێین ، دوێرم ، دبیت، دا ، نەڤێت ، چێدبیت ، دابوو ، ددا ، دایە ).**

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەڤان کارێن یاریدەدەرێن ل خاریێ دڕستەکێدا بکاربینە:

(دشێین ، دڤێت ، دوێرم ، دهێتە ، هاتبوو ، دێ هێتە)

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەڤان کارێن ل خاریێ د ڕستەیاندا بکاربینە، ب مەرجەکی جارەکێ کاریێ سەرەکی بن و جارەکێ کارەکێ یاریدەدەر بن:

(دڤێت ، هاتە ، دهات ، ڤیابا ، دبیت)

## ڕاهێنـان (٣)

ئەڤان هەردوو ڕستەیێن ل خاریٚ شروٚڤەبکە:

١- دڤێت ئەز روٚمانیٚ بخوینم.

٢- ئەو دشێت هاریکاریا هەژاران بکەت.

## ڕاهێنـان (٤)

پارچە پەخشانەکیٚ لسەر ڤی بابەتیٚ خاریٚ بنڤیسە، پاشی هەر چ کارەکیٚ یاریدەدەر هەبیت دیاربکە:

(هـەیڤا ئـاداریٚ ، هـەیڤا خوٚشـی و نەخوٚشـیانە ، هـەیڤا سـەرکەفتن و کارەساتانە)

# خالبەندی

- تو چەوا دەمی دزانی؟

- ئەڤە كارەكێ بساناهییە. سەحا دەمژمێرا خوّ بكە و بزانە دەم چەندە؟

- باشە. ئەرێ بەری دەمژمێر بهێتە داهێنان، چەوا دەم دهاتە زانین؟

- ب ئاڤێ دهاتە زانین.

- ب ئاڤێ! چەوا؟

-ئاڤ دكرنە دئامانەكیدا و كونەكا بچویك ل بنێ وی ئامانی دكر. ئاڤ ب رێك و پێكی چپك چپك ژ كونا وی ئامانی دهاتە خارێ، ئەڤجا لدویڤ وێ ئاڤا ژ ئامانێ كونكری دهاتە خارێ، دزانین كا دەم چەندە.

* * *

ژ ئاخفتنا ل سەری، دەمێ ڕستەیا (چەوا دەمی دزانی) دخوینین، پێدڤیە دەركەفتنا دەنگێ مەیێ وەسا بیت كو پرسیار تێدا بیت، دیسان دەمێ ڕستەیا (ئەڤە كارەكێ بساناهییە) دخوینین. دڤێت دەنگێ مە یێ وەسا بیت كو راگەهاندن تێدا بیت، هەر وەسا دەمێ ڕستەیا (ب ئاڤێ) دخوینین. دڤێت دەنگێ مە یێ وەسا بیت كو حێبەتیەك تێدابیت. ئەڤجا پشتی ئەڤێ هەكە سەحا دووماهییا ڕستەیا ئێكێ بكەین دێ ڤێ نیشانێ (؟) بینین. كو نیشانا پرسیارێیە و هەكە سەحا دوماهیا ڕستەیا دووێ بكەین دێ ئەڤ نیشانە (٠) كەفتە بەر چاڤێ مە، كو نیشانا دوماهیا ڕستەیێ یە، هەكە سەحا دوماهیا ڕستەیا سێیێ بكەین، دێ ڤێ نیشانێ (!) تێدا بینین كو نیشانا حێبەتیێیە (سەرسوڕمان). ئەڤ نیشانە و هندك نیشانێن دی كو ژ نهو پێڤە دێ كەڤنە بەرچاڤێن مە دبێژنێ (خالبەندی).

هەکە ئەڤ نیشانە ب دروستی ل جهێ خوٚ بهێنە دانان دێ گەلەك هاریکاریا خوینەڤانان کەن. کو ب ساناهی د خواندنێ بگەهن و خەلەتییێ تێدا نەکەن.

هەر نیشانەك ژوان نیشانان، ناڤەکێ تایبەتی و جهێ خوٚ هەیە، د ڕستەێیدا، ل خارێ دێ ناڤ و جهێ هەر ئێك ژ وان نیشانان بەرچاڤ کەین.

## ئێك: خالێ (.)

خالێ راوەستانەکا دروست نیشاددەت و ل ڤان جهان د هێتە بکارئینان:

١- ل دوماهیا هەر ڕستەکێ دهێتە دانان، ژبلی ڕستەیا پرسیاری و سەرسوڕمانێ وەك:

- ئاسوٚ برازاییێ منە.
- ڕوٚژ ژ ڕوٚژهەلاتیڤە دهەلیت و ژ ڕوٚژئاڤایڤە ئاڤا دبیت.

٢- پشتی پیتا ئێکێ یان پیتا ئێکێ و دووێ یا ناڤەکی وەك:

م . بوٚتانی.

د . ق . ئامێدی.

## دوو: دووخالێ (:)

دوو خالێ ل سەر ئێك نیشانا ڕوونکرن و راڤەکرنێیە و ل ڤان جهان دهێتە بکارئینان:

١- ل پێشیا ئاخفتنەکێ، کو وەك خۆ بهێتە ڤەگێڕان، یان بهێتە گوتن وەك: نەسرینێ گوت: (ئەڤە دەسمالا من نینە).

٢- پشتی پەیڤەکێ یان ئاخفتنەکێ، کو پێدڤی ڕاڤەکرن و ڕوونکرنێیە، وەك:

سالێ ژ چوار وەرزان پێك دهێت: بهار ، هاڤین ، پاییز ، زڤستان.

٣- ل پێشیا ئینانا نموونەیان (بو نموونە، وەك .........)

دهێتە بکارئینان، چێدبیت پشتی وان هەردوو خالێن لسەر ئێك تەقەلە بهێتە دانان وەك:

هەڤالکار ، بو تەمامکرنا هەڤالکارەکێ دی ژی دهێتە بکارئینان

شاسوار ، زۆر جوان ب عەرەبی دئاخڤیت.

## سێ -بۆر ( ، ):

بۆر نیشانا کورتترین ڕاوەستانە و ل ڤان جهان دهێتە بکارئینان:

١- پشتی ناڤێ گازیکری وەك:

کوڕینو ، بخوینن ، ب خواندنێ دێ گەهنە ئارمانجێ.

٢- دناڤبەرا جهگر و جه لێ گرتیدا، وەك:

ئەحمەد نالبەند ، هۆزانڤانێ، بناڤ و دەنگ، ل باژێرکێ بامەرنێ دژیا.

٣- بۆ ژێك جوداکرنا زنجیرەکا پەیڤان، کو بسەر پشکەکێ ژ پشکێن ئاخفتنێ بن دڕستەییێدا و ب ئامرازێ لێکدر پێکڤە نەهاتبنە گرێدانی، وەك:

پشکێن ئاخفتنێ ئەڤەنە: ناڤ ، جێناڤ ، هەڤاڵناڤ ، کار ، هەڤاڵکار ئامرازێ پەیوەندی ، ئامرازێ لێکدەر و ئامرازێ بانگکرنێ.

٤- بۆ ژێك جوداكرنا زنجیرەكا پەیڤان، كو دوو دوو پێكڤە هاتینە بكارئینان وەك:

جووتیار ب گەرمیێ و سەرماییێ، ب خوشی و نەخۆشی، زەندو باسكێن خۆ هەلداینە، ئەردی دكێلیت، خوارنێ بو مللەتی پەیدا دكەت.

٥- پشتی ڤەگێرانەكا ئێكسەر، ئانكو دەمێ ئاخفتنكەر، ئاخفتنەكا خو یا كەڤن ڤەگێریت، وەك:

من ب خۆ گوت، (دارا تەڕ نەبڕە)

٦- ل پێشیا ئامرازێ لێكدەر (و ، یان) ب مەرجەكی نەكەفتبنە سەرێ ڕستەیێ وەك:

نە ئەز هاتبووم بۆ ئاهەنگێ، و نە نژیارێ برایێ من

پەرتووكا من بینە، یان یا خۆ بدە من.

٧- پشتی گرێیەكا درێژ بۆ پاراستنا ڕامانا رستێ ژ سستییێ وەك:

دارستانا ڕەخێ دی یێ رووباری ژ دارستانا ڤی رەخێ رووباری، چڕترە.

٨- پشتی پەیڤا (بەلێ) و (نە ....... نەخێر) وەك:

بەلێ، ئەڤە كتێبا منە.

نە، ئەڤە یامن نینە.

نەخێر، دوهنێ مە دسەرێ مە نەدەن.

٩- ل جهێ كارێ هاتیە ڕاكرن (حەزف كرن) وەك:

ئەز دێ چمە ئاكرێ و ئەو ژی بۆ هەڤلێری.

١٠- بۆ جوداكرنا پاڕستەیا ناڤی، هەڤالناڤێ، هەڤالكاری ژ شاڕستەیێ د ڕستەیا لێكدایدا وەك:

ئ- من گوه لێ نەبوویە، كو هوین هاتینە ڤێرە.

ب- ئەو بەفرا، كو ل زڤستانێ دباريت، ل هاڤينێ دحەليێت.
پ- هەكە من كارێ خو بدوماهی ئينا، دێ سەرا هەوە دەم.
١١- درستەيا لێكدايدا، چێدبيت شوينا ئامرازێ لێكدەر (و) بهێتە بكارئينان وەك:
سيروانی دڤيا بچيتە بازێری، هەسپێ خو ئينا، زين لێكر، سياربوو، كەفتەرێ، ب رێڤە باران باری، هەرتشتەكێ لبەر،تەربوو.
١٢- چێدبيت ل جهێ (كە) يا لێكدەر درستەيێدا بهێتە بكارئينان وەك:
من پێخوشە، سەرا هەوە بدەم
كەس ئە كەسە، يێ ل روژا تەنگاڤيێ د هەوارا تە بهێت.

## چوار - بورو خالێ ( : ):

بورو و خالێ بو بێهن ڤەدانەكا درێژتر ژ بێهن ڤەدانا بورا سادە دهێتە بكارئينان وەك:
ل كومەلا فروكەڤانيا عێراقێ دێ فێری فروكەڤانيێ بين" ل وێرێ بلا مە ئاگەه ژ ئێكدو هەبيت، ل دەمێ فرينێ" بلا هەر ئێك ژ مە خەلەتيێن يێ دی بەرچاڤ بگريت، دا ل جارێن بهێتن دووبارە نەكەينەڤە و ب دروستی فێری هاژوتنا فروكێ ببين.

## پێنج - نيشانا پرسيارێ ( ؟ ):

نيشانا پرسيارێ ل دوماهيا وێ رستەيێ دهێتە دانان كو پرسيار تێدا هەبيت وەك:
ب تو ب چ ژ رووباری دەربازبووی؟
تو كەنگی گەهشتی؟

### شـەش - نیشانا سەرسوڕمانێ ( ! ):

ئەڤ نیشانە ل دوماهیا پەیڤان، یان وان ڕستەیان دهێتە بکارئینان کو سەرسوڕمانەك یان خەمەك،یان هەستەكێ دەروونی تێدایە، وەك:

- تو چەند درەنگ هاتی!
- ئای! تە ئەز ئێشاندم!
- ئوخ! ئەڤ هنارە چەندا خوشە.
- بەرێ خوَ بدە ڤێ گولێ، چەندا جوانە!
- پەح! ئەڤرو چەندا سارە!

### حەفت - جووتە کڤانێن بچویك (( )):

ئەڤ نیشانە ل ڤان جهان دهێتە بکارئینان:

١- بەری و پشتی پەیڤەکێ، یان ڕستەکێ، کو لنك خویندەڤانی جهێ حێبەتییێ بیت، یان بڤیت سەرنجا خەلکی بوَ بکێشیت وەك:

- تنێ شێوازێ ((جزیری)) ب دلێ منە، د دارشتنا هوَزانێدا.
- ژ گولێن باغچێ مالا هەوە گولا ((شەبوَ)) یا جوان بوو.
- مروَڤێ دلسوَز ئەو کەسە یێ کو ((مفای دگەهینتە مللەتی)) و دەستێ هاریکارییێ بو کەسێن دی درێژ دکەت.

٢- بەری و پشتی وان ئاخفتنا دهێتە دانان کو دەستکاری د دەقێ ویدا نەهێتە کرن وەك خو بمینیت وەك:

- هەڤالێ من گوتە من (( ئەز ب دەرچوونا تە، وەك گولێ گەشبووم))
- بابێ من هەردەم دگوتە من ((کوڕێ من بخوینە، ب خواندنێ دێ پێشکەڤی))

## هـەشـت:- کڤانا مەزن (      ):

ئەڤ نیشانە:

١- پەیڤـەك، یـان گرێیـەك، یـان ڕسـتەیەك دکەفتـە دنافـدا، کـو رامانـەکا تایبەت هەبیت، دڕستەکا دیدا وەك:

- جگەرخوین (شیخ موسا) شاعیرەکێ مەزن بوو.

- باژێرێ سلێمانێ (کو دکەڤیتە بنارێ چیایێ ئەزمڕ) سلیمان پاشایێ بابان ئاڤاکریە.

٢- پەیڤا بیانی، وەك:

- باژێرڤانی (بلدیە) خزمەتا خەلکی دکەت.

- میری (حکومەت) ژ مللەتی یە و بو مللەتی یە.

٣- سالا ژدایك بوونێ، وەك

- جەمیل سائیب ل سالا (١٩٢٥) چیرۆکا (لەخەوما) نڤیسییە.

## نەهـ - هێل یان تەڨەلێ:-

ئەڤ نیشانە ل ڤان جهان دهێتە بکارئینان:

١- بو ژێك جوداکرنا ئاخفتنا دوو کەسان، وەك:

ئەز ل مال روینشتبووم، قادرێ هەڤالێ من هات و گوت:

- ئەڤە دوو رۆژە تو دیارنینی؟

- ئەز یێ نەخۆشبووم و دناف نڤینارابووم.

- ئەرێ نوکە تو یێ چەوانی؟

- ئەز یێ باشم.

٢- چـێدبیت ل جهـێ وان هـەردوو کڤـانێن مـەزن بهێتـە بکارئینـان، کـو پەیڤـەك یـان گرێیـەك، یـان ڕسـتەیەك (رامانـەکا تایبـەتی هـەبیت د ڕستەیەکا دیدا) وەك:

بیابانا مەزنا ئەفریقیا (وەك من گولێبوویە) رویبەرەکێ بەرفرەه هەیە د نیشتمانێ عەرەبیدا.

٣- دنافبەر ژمارەی و هژمارتیدا، هەکە کەفتە سەرێ ڕستەییێ وەك:

ژ ئەنجامێ هەمی سەرکەفتنادا:

ئـ- زوّر خەستەخانە و مەڵبەندێن ساڤایان دهێنە ڤەکرن.

ب- گەلەك باژێرو گوندێن نوی دهێنە ئاڤاکرن.

پ- بارێ ئابوورییێ وەلاتی سەروژنوی بنە جه دبیت.

ت- تەناهی دکەفتە وەلاتی.

٤- ل دوماهیا مالکێ: هەکە جهێ نڤیسینا هەمی برگەییێن پەیڤا دوماهیا ڕستەییێ ب دروستی تێرا نەکر، بوّ نموونە هەکە جه نەمابیت کو پەیڤا (هنارەکە) هەمی د مالکەکێدا بهێتە نڤیسین دێ هێلەکا بچویك پشتی وێ پەیڤێ هێتە دانان، کو چێدبیت د مالکێدا بهێتە نڤیسین. ئەو پشك ژێ دی ئێك ژ ئەڤانا بیت:

__________ هە __________

نارەکە __________

هەنا __________

رەکە __________

__________ هەنارە __________

کە __________

**دەه - چەند خاڵەك ( ..... ):**

ئەڤ نیشانە ل ڤان جهان دهێتە دانان، کو پەیڤ، یان گرێ، یان ڕستە ژێ هاتیە لادان (حەزف کرن) ب مەرەما کورت کرنێ و گوتنا یێن گرنگ بتنێ وەك:

١- دگەل ماموٚستاییٚن خوٚ چووینە سەیرانێ، ل وێرێ مە دەست ب یاریا و مەلەڤانیا کر و .......... ئێڤاری ب خوشی و شادی ڤەگەڕاینە مالێ.

٢- هەکە بخوینی، دێ سەرکەڤی، ئەگەر نە .................. .

٣- د یالێکتا کرمانجیا ژوٚری ژ بوٚتانی، بادینانی، هەکاری، .............. هتد پێك دهێت.

**دەستوور:**

خالبەندی، یان دانانا خالێ و نیشانە، دناڤبەرا پشکێن ئاخفتنێدا ل دەمێ نڤیسینێ، بوٚ ژێك جوداکرنا وان، یان گرنگیدان ب دەربڕینا دەنگی و سوٚزێ، ل دەمێ خواندنێ کارەکێ گرنگ و پێدڤییە، خالبەندیێ پەیوەندیەکا بهێز و فرمانی هەیە ب خواندن و رامانا ئاخفتنێ، چنکو هەر گوتنەك، ژ چەند پشکەکا پێك دهێت و هەر پشکەك ژی ژ کوٚمەلەکا ڕستەیان پێك دهێت، ئەڤ ڕستە ژی هندەك سادە و سەربخوٚنە، یان هندەك چووینە پالێ ئێکدو، یان تێکەل، جار ژی هەیە، ڕستەك دناڤ ڕستەکا دیدا دهێتە دیتن، کو ڕامانا وێ سەر ب ڕستەکا دییە، ژبلی ڤێ ڕستە ژ چەند پەیڤێن هەمە جوٚر دروست دبیت و نڤیسەری ژی دڤێت وێ خەمێ، یان دلخوشییێ، یان هەر کارەکێ دی یێ دەروونێ خو ب وان پەیڤان دەرببڕیت، بو کەسەکی دانیت، یان پرسیارەکێ بکەت، ئەڤ خالبەندیە، ئانکو ئەڤ نیشانەیێن ئەم لسەر ئاخڤتین، باشترین هوٚکارن د دەستێ نڤیسەریدا. کو دنڤێسینێدا هەستێ خوٚیێ دەروونی پێ دەربیڕیت. هەروەسا د دەستێ خویندەڤانی ژیدا کو خەلەتیا د خواندنێدا نەکەت، نیشانە ژی ئەڤەنە:

١- خـالٓ، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( • ).

٢- دووخالٓ، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( : ).

٣- بۆر، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( ، ).

٤- بۆرو خالٓ، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( ؛ ).

٥- نیشانا پرسیاری، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( ؟ ).

٦- نیشانا سەرسوڕمانی، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( ! ).

٧- دوو كڤانێن بچویك، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن (( )).

٨- كڤانا مەزن، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن (      ).

٩- هێل یان تەڤەل، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( ---- ).

١٠- چەند خالەك، ب ڤی شێوەی وێنەیێ وێ دهێتە چێكرن ( ........ ).

## ڕاهێنـان ( ١ )

ئەڤ ڕستەیێن ل خارێ، خالٓ و دووخالٓ و بۆر ژێ دكێمن، تو بو دانە" ب مەرجەكی هەر ئێك ژوان، ل جهێ خۆ بیت.

١- هـەیڤا دەسـتكرد ژ داهێنـانێن مەنـدەهۆش بوونێیـە ئـەڤجا هەكـە بـو مـەرەما ئاشـتیێ بهێتـە بكارئینـان دێ خزمـەتا مرۆڤایـەتیێ كـەت كـو وەلاتـێن جیهـانێ ب تۆرەكـا بێتێـل پێكڤـە گرێـدەت و بـەرنامێن تێلـــەفزیونێ وتشـــتێن دی ژ وەلاتـــەكی بـــو وەلاتـــەكێ دی بهێنەڤەگوهاستن.

٢- هەیڤ بومە نێزیكترە ژ ڕۆژێ.

٣- بـازار نێزیكـی مـەبوو خـانیێ مـە ل پشـت بـازاری بـوو ئـەڤجا هـەر تشتەكێ مە ڤیابا دا بساناهی كڕین.

٤- جـادێن مـەزن ل بەغـدا ئەڤەنـە جـادا ڕەشـید و جـادا كیفـاح جـادا جمهوری.

## ڕاهێنـان (٢)

نیشانێن پرس یان سەرسوڕمانێ بۆ ئەڤان ڕستەیان دابنە.

ئ- پەح ئەڤ هنارە چەندا ترشە.

ب- کەنگی هەیڤ دەردکەڤیت.

پ- ئافەرین بۆ تەو دەست ڕەنگینیاتە.

ت- دەمێ ژ قوتابخانێ ڤە دگەری دێ کتێبێت خو دانیە کیڤە.

ج- ڤیانێ ژ خۆشیادا هاوارکر و گوت: باب ئەز یا ئێکێ دەرکەفتم.

چ- دێ ب چ چییە بەغدا.

خ- دەنگ چەوا ب تێلا تێلەفونێ دهێتە گوهێ مە.

## ڕاهێنـان (٣)

ئەڤێ پەخشانێ بخوینە، پاشی بزانە، ل چ جهـ پێدڤی هێل و کڤانا مـەزن و کڤانا بچویك یان هەر نیشانەکا دی هەیە، بو دانە:

ئازادی گـوت، گەلـەك دەنـگ و باسـێن زانسـتی دخـوینین" دەنـگ و باسـێ ڕۆژغـەیرین و هـەیڤ غـەیرین ئێکـە ژ وان دەنـگ و باسـا، ڕۆژ غـەیرین و هەیڤ غەیرین دهەر هەیڤەکێدا ڕوینـادەت وەك هنـدەك هـزر دکـەن، چونکو خولگەیا هـەیڤێ لـدور ئـەردی دگـەل خولگـەیا ئـەردی لـدور ڕۆژێ، جـووت نابن و ب گۆشەکێ بچویك ژێ خواردبیـت، ژبـەر وێ چـەندێ دەمـێ هـەیڤ دناڤبەرا ئەردی و ڕۆژێـدا دبوریت ب زۆری ب سـەر یـان خـوارێ وێ هێلـێ دکەڤیت کو ژ مەلبەندێ هەر دووکاندا دبوریت، ژبەر وێ چەندێ، هـەیڤ و ڕۆژ ناغەیرن هەکە نەکەڤنە سەر ڕێکا وێ هێلێ.

مام هۆمەری پرسیارکر: ئەرێ بەحسێ فڕینا فرۆکێ ناخوینین؟

– ئازادی گوت: بەلێ مە خواندییە، هەکە نێزیکی فرۆکخانەیەکی ببی و چاڤێ تە ب فرۆکەکا پەروانەدار بکەڤیت، کو ئەڤە سادەترین جۆرێ فرۆکێیە دێ ئەڤە بۆ تە دیاربن، پەروانەك ب پێشیا ویڤەیە و پەڕێن وێ د درێژن و سەرێ ڕوییێ خوارێ یێ پەڕێن وێ ڕاستەو دگەل بارێ ئاسویی پیچەکێ یێ خوارە.

بەلێ سەرێ ڕوییێ ژووری یێ خوار و کڤانەییە.

مام هۆمەری گوت: ب ڕاستی ئەم نە دشارەزاینە.

## ڕاهێنان (٤)

ئەڤێ هۆزانا مامۆستا (بەدرخان سندی) بخوینە و پاشی لدویڤ پێدڤیێ نیشانا خالبەندی بۆ بکاربینە:

| | |
|---|---|
| ئەو شەپالا ئەز ژی دیرم | ئەڤرۆ کوڤانە گەلۆ |
| ڕوندکێن ڕێز ڕێز دبارن | ئەڤ چ فەرمانە گەلۆ |
| ئەز دزانم دلبەرا من | هەر یاپڕ ژانە گەلۆ |
| لێ چەوا ژ خەو نەرابی | مانە دیلانە گەلۆ |
| مانە نەوروزە بوهارە | مانە سەیرانە گەلۆ |
| ئەو چەوا بلبل نەخاندن | بۆچی ڤەمانە گەلۆ |
| بلبلەك هات چەنگ شکەستی | گوتی تالانە گەلۆ |

دەردەکێ گرتی گرانە | نە ژ نازانە گەلۆ
کانێ نوژدار کانێ زانا | لەرزە و تانە گەلۆ
دل ژ دل ئەڤرۆ پڕ کولە | دلێ بێ سەمیانە گەلۆ
هین دزانن کو ئەڤیندارە | توخمێ لالانە گەلۆ
ئەو ژ بەژنێ را چ شوخە | بەژنا خانانە گەلۆ
یا ژ ریمەت قەت نەبێژن | ئەو پەری خانە گەلۆ
دلبەرا چاردە بوهاری | ئەڤ چ فیغانە گەلۆ
قەت دبت دلبەر نەساخ بت | ئەڤ چ لەیلانە گەلۆ
ئەژدەهاک ئەڤرۆ دزۆرن | زۆرێ خاقانە گەلۆ
هەر ژ هنگێ مللەتێ مە | دیل و قوربانە گەلۆ
زاروێن کوردان دکوشتن | مەژی دەرمانە گەلۆ
داپێ ساخ بت شاهێ فارس | دەردێ مارانە گەلۆ
لێ نهو مار چارسەرینە | خوین لێ ئەرزانە گەلۆ
پێ و دەستێن مە دپیڤن | سەر بێ کێشانە گەلۆ

*　　*　　*　　*

## (بابەتێن بەشێ ئەدەب)

١- داستانا كوردی ( قەلاٚی دم د م )

٢- ڕێبازێن ئەدەبی - ڕێبازا كلاسیزم

٣- ئەدەبیاتێ كلاسیزمی كوردی - شێوەیێ لـوڕی

٤- ئەدەبیاتێ كلاسیزمی كوردی - شێوەیێ گـۆران

٥- ئەدەبیاتێ كلاسیزمی كوردی - شێوەیێ كرمانجیا ژووری

٦- ئەدەبیاتێ كلاسیزمی كوردی - شێوەیێ كرمانجیا خوارێ

٧- دەسپێكـا پەخشانا كوردی.

٨- مێژوویـا ڕۆژنامەگەری و پەیوەندییاوێ ب گەشەسەندنا پەخشانا كوردیڤە .

## بابەتـێـن بەشێ نموونەی ئەدەب

١- مەلایێ باتەیی

٢- حەسیب قەرەداغی

٣- كـوردی

٤- كـانـی

٥- مەلا تەهایێ مایی

٦- كامەران موكری

٧- مەلا مەحموودێ بایەزیدی

٨- میر جەلادەت بەدرخان

# ١- داستانا كـــوردى
# كـــەلا دمدم

ژێـدەرێن مێـژوویی ب درێـژاهی بەحسـێ وان رویـدانێن گـرنگێن سـالا ١٦٠٨ز كرییە، ژلایێ ڤەگێرانا مێژوویێڤە ب ساناهی دشێێن دسەرچاوێن فارسـی و كوردیـدا بگـەرێێن بـۆ راسـتیيا ڤـێ قارەمـانییێ وب كـوم شـەهیدبوونا كـوردان و سـەر نەچـەماندنا وان، قارەمـانێن كـەلا دەمـدم ب سەروكـاتیا (خـانێ لـەپ زێـرین) تـا دومـاهی هەناسـە و دومـاهی دلوپـا خوینێ بەرانبەر داگیركەران شەڕكرن و مرنا ب كوم ب باشتـر زانی ژ سەر شوركرنێ، ڤی كەڤالێ مەزنێ قارەمانەتییا ئـەدەبێ كـوردی رووبـەرەكێ زوێر ڤەگرتییە، ئەگەر داستانێن دی ژ داستانێن فولكلوێری هاتبنە وەرگێـران بوێ داستانێن شعری یێن نڤیسی .. داستانا كـەلا دمدم ژ رویـدانێن دیروێكـی بوویە داستانا فولكلوێری و داستانا فولكلوێری بوویە چیـروێكا سـەر ژ نـوی و رومانا نوی، ژ دەسپێكا سەدەییێ هەڤدێ تا ئەڤروێ پاڵەوانیا جەنگاوەرێن كـەلا دمـدم ل سـەر زارێ سـتـرانبێژ و چیـروێك ڤەگێـرێن كـوردە، ل هـەمی دەڤەرێن كوردستانێ وب هەمی دیالێكتێن كوردی دهێنە ڤەگێران.

ڤی بەرهەمێ فولكلوێری گەلـەك لایـەنێن خوراگریا جـەنگاوەرێن كـەلا دمدم بەرچاڤكرینە و بەشـەكێ دی هـەتا نوكـە ل سـەر زارێ خـەلكی ماینـە. روێژ هەلاتناسان گەلەك ژمە پتـر پویتە ب سەرهاتی و بەیتێن كـەلا دمـدم دایـە، هەروەكی وان بـەلاڤكری و كریـە روێسـی و ئـەلمانی و فرەنسـی و ئـەرمـەنی، هەروەسا كرییە فارسی.

زانایی کوردیێ سوڤێتا بەریێ (ئوردیخانیێ جەلیل) چەند ڤەگێرانێن داستانا کەلا دمدم تومارکرینە و بوٚ زمانیێ روسی ژی وەرگێرایە ول سالا ١٩٦٧ز بەلاڤەکرییە.

ئەڤ داستانە ل کوردستانا عێراقی ب شێوێ چیروٚکا سەر شانوییێ هاتییە نڤیسین، نڤێسەر (مستەفا سالح کریم)ی ل سەر بنیاتێ کەرستێ میژوویا پیەس (شانویی) (شەهیدانی قەلایی دمدم) نڤیسیە ول سالا ١٩٦١ز هاتیە چاپکرن، هەر کەرەستێ دیروٚکی و فولکلوٚرییە بوویە ژێدەر بو دانانا چیروٚك وروما نا کوردی.

نڤێسەرێ ناڤداریێ کوردێن سوڤێتا بەریێ (عەرەبێ شەموٚ)ی ل سالا ١٩٦٦ز ڕوٚمانەك ب زمانیێ کوردی و پیتێن ڕوٚسی (سلاڤی) ل یەریڤان چاپکرییە پاشی بوٚ زمانیێ روسی هاتیە وەرگێران و ل سالا ١٩٦٩ ل موٚسکوٚ هاتیە چاپکرن. عەرەبێ شەموٚی هەوڵدایە پەیوەندییێن دوستینیا کورد و نەتەوێن هەڤسوییێن وان روونبکەت، ب تایبەتی خەباتا ڤان گەلان بەرانبەر داگیرکەرێ ئیرانی و عوسمانی، هەروەسا وێنەییێ بژارە ییێ ژیانا جڤاکی و ئابوری یا کوردستانیێ ل دەستپێکا سەدیێ هەڤدیێ کێشایە، هێشتا ئەڤێ داستانا مەزن جهێ خوٚ د توریێ کوردیدا و جیهانێدا نەکرییە.

١- د ڤەگێرانەکا داستانێدا میر (خانیێ لەپ زێرین) کو سەرکردیێ کوردان بوو، گازیا مەردانە بەرانبەر (شاه عەبباس)ێ ئیرانی بلند دکەت و دبێژیت:

خـەلـقـێ مـەنـایـێ ڕایـێ

هـیڤیـا دوژمنـە ل مـەیـدانێ

مـینـا شێـرا ئـەو شـەردکـە

هـەرتـم دوژمنـا لـەت دکـە

مـەنە خـوٚفێ عەسـکەرێ تە

مـەنە خـوٚفێ خـانێ تەوریٚزێ

گـەلـێ راناکـە ژ هـەمبیٚزێ

مەنە ترس خانێ چین و ماچینێ

قـڕ نـاکـە خـەلقێ مـە

مـەنە خـوٚفـێ تـەیمـوورییا

بـەلا نـاکـە خـەلقێ مەلەچیا

تـاجـێ تە قـەبول نـاکـەم

..... ..... .....

کـوردسـتـانێ بێ نـاف ناکەم

(بوٚ ژبەر کرنێیە)

| پەیڤ | ڕامان |
|---|---|
| نایێ رایێ | : نایێتە سەر ڕێ (واتە: بوٚ شاه عەبباسی). |
| هیڤی | : هیوا ، بەهیوا ، بەتەما |
| مینا | : وەکو |
| شێرا | : شێران |
| هەرتم | : هەردەم ، هەرکات |

| | |
|---|---|
| کەلیێ | : کەلهە ، قەلا |
| هەمبێز | : ڤەحەواندن، لڤێرە ب رامانا (مەیدان) هاتییە. |
| قرناکە | : ژناف نابەت ، لە ناونابەت |
| بەلاناکە | : لەناو ناچێت |
| بیێ ناڤ ناکەم | : بەدناو ناکوم |

نموونەیەکادی ژ ڤەگێرانەکا دی یا ڤیێ داستانیێ ب زاریێ موکریانی چیروٚك بێژ دبێژیت:

خان ئەو دال و کاکە خانە
حەوت شەوانە و حەوت روٚژانە
شەڕیان دەکرد بەشیرانە
شیران نەیاندیت کێلانە
لەش کەوتن وەکی گردانە
خوین روٚیی هەروەك جوگانە
بالچووغەیی شێران نەمانە
شەهیدیان کرد کاکە خانە
خان دەلیێ: خانی خەزایمە
هەتا لە دنیێ ئەز بژیمە
بوٚ خوٚم بەرژینی شەریمە
خان ئەو دال و کاکە خانە
گرتبوویان وەعد و پەیمانە

(هەمی بوٚ ژبەر کرنێیە)

## ڕاڤەکرنا پەیڤـان:

| | |
|---|---|
| بەشیـرانە | : ب شمشێـر ، ب شیـری |
| کێـلان | : کێلانا شمشێـری |
| گـرد | : گـر |
| جۆگـە | : جـۆك |
| بالچووغە | : جهیٚ شەڕی ، شوێنی شەر ، شەڕگەه |
| خەزا | : غـەزا ، جەنگی پیـرۆز |
| دنـیٚ | : دنـیا |

# رێبـازێن ئـەدەبـی

## رێبازا کلاسیـزم:

رێبـازێن ئـەدەبی بـۆ جـارا ئێکـێ ل ئوروپـا پشـتی سـەردەمێ راپـەڕینێ ل دەوروبـەرێن سـەدێ هەڤـدێ زاینـی سـەرهەلدا، دنـاڤ وان رێبازێن ئەدەبیدا کلاسیزم کەڤنترین رێبازە ژلایێ پەیدابوون و بەلاڤبوون و دەسـەلات پەیـداکرن ل سـەر بەرهـەمێن ئـەدەبی.... بـەری وی سـەردەمی (ئەدەب)ی شێوازەکێ ئازادانـە رێکا خـو گرتبـوو، کـو دیـارە لڤێـرە ئـەدەب زۆر ژ رێبـازان کەڤنتـرە و هـەر ژ دەسپێکێ ب شێوازەکێ سـەربخۆ هـۆزان هاتییـە گـوتن ... بێ هـیچ ئاگەهییـەك هـەبیت دەربارەی رێنما و بنـەمایێن وان رێبـازێن ئـەدەبی و ئەگـەر هـەر سـاخلەت و تایبەتمەندییـەکا گشـتی هـەبیت کـو هۆزانڤـانـان پـەیرەوکربیت... وی دەمـی ئـەو پـەیرەوکرن ژ ئەنجامێ هیچ پێك هـاتن و دئێك گەهشتنەکێ نـەبوو بـەلکی هۆزانڤـانـان ب سەلیقەیا خۆ ئەو تایبەتمەندی دەسنیشانکرییە.

بزاڤا سـەرهلدانا ئوروپـا د قـادا ئـەدەب و هونەریـدا بوویـە ئەگـەرێ ژدایـك بوونا ئێکەم رێبازا ئـەدەبی و هونـەری ددیروکا مروڤایـەتییێ دا کـو رێبـاز (کلایزم)ە و ب شێوەکێ تایبـەت دماوێ سەدێ هەڤدێ زایینی دا ل وەلاتێ فرەنسـا گەشـەکر، دسـەدەیەکیدا دا کـو ب سـەدێ زێـرین دهێتـە دانـان دمێـژوویا فرەنسا دا... هەرچـەندە بـەری هینگـێ دەسپێکـا ڤـێ رێبـازێ ل ئیتالیـا پەیـدابوو، پاشـی بـەرەف ئنگلتـەرا و ئـەلمانیا و وەلاتـێن دی یـێن ئوروپی بەلاڤەبوو.

پەیڤا کلاسیزم ژ(کلاسس – Classi)ا لاتینی هاتییە، کو دبنیاتدا ب رامانا یەکەیەکا (کەشتی گەل)[1] دهێت، هەر ژوێ رامانێ بوٚ یەکەیا خواندنێ یان پوٚلا خواندنێ هاتییە بکارئینان.

ناڤکرنا جوٚرە ئەدەبەکی ب ڤی ناڤی، ویێ چەندێ دگەهینیت کو ئەو جوٚرە ئەدەبە نەمرە و ب درێژاهیا ڕوٚژانان ب کێر ویێ چەندێ دهێت کو بوٚ پەروەردە و فیرکرنا گەنج و لاوان ل پوٚلێن خواندنێ بهێتە بکارئینان. هەر ژبەر ڤێ ئەگەرێ ژی بوو کو هەردوو ئەدەبیاتێن کەڤنێن یونانی و روٚمانی ب ئەدەبێ کلاسیزمی هاتیە دانان، چونکە خواندان ڤان هەردوو جوٚرە ئەدەبان ل قوتابخانە و زانکوییێن ئوروپا یێن جارن ونهو ژی باشترین هوکار بوویە بوٚ پەروەردەکرن و گەشکرنا هزر وبیرێن لاوان، ئەڤرو ژی خوێندنا زمان و ئەدەبیاتێ یونانی و لاتینییێ کەڤن د زانکویاندا ب کلاسیزم دهێتە دانان.

کلاسیزم د ئەدەبیدا لاسایی و (چاڤلێکرن)ە" لەوما ئەو گەشکرن و پێشڤە چوونا ئەدەبی ئەوا ل ئوروپا سەرهەلدای، هەمی ل سەر بنیاتێ چاڤلێکرنا ئەدەبێ یونانی و روٚمانی هاتییە دامەزراندن، هەر ئەڤێ ئەگەرێ ژی وەکر کو نڤیسەر و تورەڤانییێن سەدێ هەڤدێ مل ب ملێ رەخنەگرێن وی سەدەی زاراڤێ کلاسیزم بوٚ رێبازا خوٚ یا ئەدەبی یا نوی دانن.

---

(١) کەشتی گەل: ژمارەکا کەشتی یان (اسطول).

رێبازا کلاسیزمی لدەف ئوروپییان ب گشتی چەند ساخلەت وتایبەتمەدی هەنە، گرێدایی چەند رێنما و بنەمایانە:-

١- تاما خۆ ژ تورێن یونانی و لاتینی وەردگریت و ماددێ وێ یێ ئەدەبی ژی بۆ وێ ئێکێ کو نڤیسەرێن سەدێ هەڤدێ بەردەوام چاڤێ وان ل وێ چەندێ بوویە جۆرە ئەدەبەکێ وەسا پەیدابکەن کودبابەت و هێزا خۆدا وەکی یێن یونانی ولاتینی یێن کەڤن بیت.

٢- ئەڤ جۆرە ئەدەبە ڤەرێژا ژیرییە. دیارە گرنگترین ساخلەتێ ژیری ژی روونی و ئاشکرایی یە، ئەدەبێ کلاسیکی چونکە ڤەرێژا ژیری یە لەورا بەردەوام هەول ددەت بگەهیتە راستییێن گشتی، وهەر ژبەر ڤێ چەندێ ژی بوویە کو بەهرا پترا بەرهەمێن کلاسیزمی د ئەدەبیدا، بەرهەمێ شانوگەری بوویە، بەروڤاژی بەرهەمێن رۆمانتیکی کو بەهرا پتر پێک هاتییە ژ هۆزانێن سترانان.

٣- گرنگیدان ب دارشتن و راستڤەکرنا شێوازێ نڤیسینێ، ئەدەبێ کلاسیزمی رێزەکا زۆر ل بناغەو بنەماییێن زمانی دگریت وبڤێ ژی ژ رۆمانتیکیان جودا دبنە ڤە، چونکە رۆمانتیکی دڤی بیاڤیدا هەر دەم حەزا نویکرن و نوی خوازییێ هەیە، بۆ نموونە درۆمانتیکێدا رەنگە پەیڤ بۆ مەبەستا خۆ یا رەسەن بکارنەهێت، دکلاسیزمێدا هەر پویتە ب رەسەنایەتییێ و جوانیا دەربرینێ و زمانڤانییێ دهێتە دان" ژبەر ڤێ ئەگەرێ ژی لنک ئوروپییان نڤیسەرێ خودان شیان دزمانیدا ب نڤیسەرێ کلاسیزمی دهێتە ناڤکرن بلا بەرهەمێ وی ب بەر ڤێ رێبازێ ژی نەکەڤیت.

٤- ئـەدەبیٚ کلاسـیزمی دکەڤیتـە بـەر هنـدەك یاسـا و بنـەماییٚن تایبـەت وئێـك ژ وان بنـەماییٚن سـەرەکی روونـی و ئاشـکراییە، وهـەر ژڤـیٚ دیتنـیٚ رەخنـەگریٚ فرەنسـی (پوالـو) دویٚ باوەریٚدایـە هـەر تشـتەك ب روونـی هەسـت پـیٚ بهێتـە کـرن، دشـییٚن ب روونـی دەرببـڕین، لـەوما کلاسـیزمی دویٚ باوەریٚـدا بـوون کـو هـەر ئالٚـوزیەکا د ئەدەبیـدا هـەبیت دزڤڕیتـە ڤـە بـوٚ ویٚ ئالٚوزیـا دهـزرو بیـرییٚن نڤیسـەریدا، و نـەزالٚبوونا وی ل سـەر بابـەتی... لـەوما کلاسیزم دوژمنـیٚ ئالٚوٚزی و نە ئاشکراییٚیە.

٥- کلاسیزم د ئەدەبیدا ب کریارا چاڤلێکرنا سروشتی دهێتـە دانان و ب گشتی کلاسیزمان بوٚ چوونەکا مروٚڤانە هەیە.

ئەڤە د ئەدەبیٚ ئوروپیدا، بوٚ ئـەدەبیٚ کوردی ژی دیارە بەرهـەمێن ئـەدەبی یێن دکەڤنە بەرڤیٚ ریٚبازیٚ ب ئەدەبەکیٚ کلاسیکی دهێنـە دانان، ئەڤە ژی ژبـەر ویٚ چـەندیٚ نینـە کـو بنیـاتیٚ خـوٚ ژ ئـەدەبیٚ روٚمـانی و لاتینـی وەرگرتییە، بەلکی ئەم ژی ب هنـدەك ژوان پیڤـەرێن بـوٚ ئـەدەبیٚ کلاسیزمی ئـوروپی هاتینـە دانـان ئـەدەبیاتییٚن خـوٚ پـیٚ ب هەلسـەنگینین، ولبـەر رووناهییا ئەدەبیٚ کلاسیزمی ئوروپی ئەم ژی بەرهەمیٚ کلاسیزمی ییٚ خوٚ دەسنیشانبکەین.

دیـارە هوٚزانڤـانیٚ کـورد دەمـیٚ هـوٚزان نڤیسـی، ئازادانـەکاریٚ خـوٚ کرییـە، ئاگەه ژ هندیٚ نەبوویە کو ئـەو بەرهـەمیٚ دنڤیسـییت روٚژەك بێت رەخنـەگر و زاناییٚن ئەدەبی بوٚ پوٚلین بکەن وبێخنە بەر ئێك ژ رێبازێن ئەدەبی لدویف ساخلەت و تایبەتمەندییٚن وی بەرهەمی، لەوما ئەڤرو دشێین بەشـەکیٚ وان بنەمایا بکەینە بنیات بوٚ پولینکرنا بەرهەمێن خوٚ ییٚن ئەدەبی.

## بنەمایێن ئەدەبیاتێن کلاسیزمی کوردی:-

١- پتریا بەرهەمێن ئەدەبیاتێن کلاسیزمی کوردی هوزانن، چونکە نیشانا زالێ ب سەر وی ئەدەبێ کلاسیزمیدا شعر و هوزانە، کو ئەوژی دشێوێ شعرا ستونیدایە و ب ئێك سەروا (قافیە) هاتییە خوارێ.

٢- ئەدەبێ کلاسیزمی کوردی گرنگییەکا زور ب موکمیا واتایێ ددەت، ئەدەبەکە کو هەمی کەس نەشێن ب ساناهی تێ بگەهن، چونکە کلاسیزم ب خوێ ئەکادمیەت و قوتابخانەیە.

٣- ئێکەتییا بابەتی د هوزانا کلاسیزما کوردیدا زور کێم هاتییە پەیرەوکرن، چونکە دهەر بەیتەکێدا هوزانڤان بەحسێ ئێك جورە بابەت دکەت.

٤- پەیرەوکەرێن بابەتێ کلاسیزمێ چاڤلێکرنا بەرهەمێن ئەدەبی یێن پێش خوێ دکەن، لێ نەك چاڤلێکرنەکا کورانە، بەلکی ب بەرچاڤ وەرگرتن ول شوپ چوونا کومەکا دەستوور و دەسپێکان دەربارەی بابەتی وێنەی و شێوێ دارێژتنا هوزانێ.

٥- هوزانا کلاسیزمی کوردی ل سەرکێشا (عەرووزی) عەرەبی هاتییە دانان وترازیا وێ ئەو کێشێن زمانڤانێ ناڤدارێ عەرەب (خەلیلێ کورێ ئەحمەدێ فەراهیدی) داناینن ... وهوزانڤانێن کلاسیزما کوردی ژی هەولدایە هەمی دەریایێن ڤێ کێشێ بکاربینن.

٦- كلاسيزم پتر گرنگييێ ددەتە روييێ ژدەرڤە و روخسارو دیمەنی پتر ژ ناڤەروکێ، پتر گرنگییێ ب پەیڤسازییێ ددەت ژ ڕامانێ، ب وێنەی ژ ماددەی، هۆزانڤانیێن کلاسیزمی زۆر گرنگی ب پەیڤێ و ڕەوانیبێژییێ دایە،بۆ نموونە هۆزانێن (نالی)ڤێ دیاردێ بنەجه دکەن:

٧- هۆزانێن کلاسیزمی کوردی ل دۆر چەند مەرەم و مەبەستەکانە وژێ دوور ناکەڤن وەکی: دلداری، غەزەل، کرێتکرن، پێ گوتن و . . هتد.

٨- د ئەدەبیاتێ کلاسیزمی کوردیدا ژبەر رەوشا مللەتێ کورد، زۆر جار هۆزانڤان و شاعیرێن کورد بابەتێ نەتەوایەتی بەرچاڤکرییە و ئەڤ دیاردەیە کلاسیزما کوردی ژ ئەدەبێ کلاسیزمی یێ جیهانی جودا دکەت، نموونە ژی هۆزانێن ئەحمەدێ خانی و حاجی قادرێ کویی . . . هتد.

# ئەدەبیاتێ کلاسیزمێ کوردی شێوەیێ لــوڕی

ئاشکرایە کو پشتی سالا هەڤدێ مشەختی ئاینێ ئیسلامێ یێ پیروز ل کوردستانێ بەلاڤبوویە، ژ وی دەمی کوردستان وەکی هەمی جهێن دی یێن ژێر فەرمانا ئیسلامێ زمانێ عەرەبی تێدا زالبوو، ئەدەبیاتێ کوردی ژ ئەگەرێ بارودوخێ نوی و زالبوونا زمانێ نوی" ب لاوازی و ئاڤا بوونێ چوو، چونکە کوردان ژی وەکی هەمی مللەتێن دی یێن موسلمان بو ماوەکێ درێژ نڤیسین و بەرهەمێ ئەدەبی هەر ب زمانێ عەرەبی نڤیسییە. لێ ل سەر دەمێ سەلجوقیان ول دویڤدا ڤە. مللەتێن موسلمانێن نە عەرەب زڤرینە ڤە زمانێ خو یێ دایك، وبەرهەمێن ئەدەبیاتان پێ نڤیسینە، دیارە سەردەمێ سەلجوقیان ژلایێ مێژوویی و سیاسی ڤە یێ ئەرێنی بوو و پشتەڤانەکێ مەزنبوو بو زیندیکرن و ڤەژاندنا ئەدەبیاتان. کورد ژی وەکی وان زڤرینە ڤە سەر زمانی خو پیچ پیچە هوزانڤانان دەست دا زندیکرن و ڤەژیاندنا ئەدەبیاتێ کوردی، دەسپێکەکا نوی بو ئەدەبیاتێ کوردی ل سەر دەمێ ئیسلامێ دەسپێکر، هوزانڤانان هوزان ب زمانێ کوردی ڤەهاندن، لێ ژبەر دژواری و بەرتەنگییا روژگارێ پتریا بەرهەمان ژ ناڤچوون و نەمان کەڤنترین هوزانێن کوردی کو پشتی سەردەمێ سەلجوقیان ماینە و ژناڤنەچووینە، هوزانێن بابە تاهرێ هەمەدانینە، کو ب زارێ لوڕی گوتینە.

# بابە تاهرێ هەمەدانی

## ژیـــانـــا وی:

بابــەتاهرێ هەمـــەدانی یــێ بــەرنیاس ب بابــەتاهرێ عوریـــانی، هۆزانڤانەکێ مەزن و هەرە گەورەیێ کلاسیزمێ کوردییە، ئەڤ هۆزانڤانێ مـەزن زۆر لایـەنێن ژیانـا وی ب نـەدیارو ڤەشـارتی ماینـە، تنـێ هنـد ژی هاتییە زانـین کـو خـەلکێ باژێرێ هەمـەدان بـوو – باژێرەکـە سـەرب دەڤەرا لورستانڤە چوارینێن خۆ ب زارێ لوڕی گوتینە، مرۆڤەکێ سوٚفی و خـودێ نیاس بوو، ژ خەلکی دوور کەفت و ڤەدەری لدەف وی باشتـربوو، بەلکی بگەهیتە خوشتڤییێ خـۆ، هـەر ل هەمـەدان چوویە بەر دلوڤانییا خـودایێ مەزن گوڕێ وی ل سەر گرەکییە کو دکەڤیتە باکورێ رۆژ ئاڤایێ هەمـەدان، نوکە ئارامگەهەکا جوان ل سەر هاتییە دورستکرن.

دەربارەی ژیانا وی گەلـەك کـەس پەیڤینـە وهـەر ئێکـی ل دویـف هزرو بۆچوونا خـۆ تشـت نڤیسییە، لێ ژیانا بابەتاهری وەکـی شـاعرێن دی یێن مـەزن دوور نـە بوویـە ژ دەسـت تێوەردانا مێژووناسـێن ئـەدەبی و ئـەوێن مەنـدەهۆش پێگیـر بـوو ب بیـرو بەرهـەمێ وی یـێن ئـەدەبی" دئەنجامـدا وەسا دیار بوو کو سالا ژدایك بوونا وی بەری نیڤا ئێکێ ژ سـەدێ چوارێ مشەختی نەبوو.

میـرزا مەهدی خـان گوتـارەك دەربـارەی ژیانـا بابـەتاهری دگۆڤارا (کومـەلا ئاسـیایی) دا (بـەنگال) سـالا ١٩٠٤ز بەلاڤەکرییـە، دیرۆکـا ژدایـك بوونـا بابەتاهرێ هەمەدانی لپەی ڤێ چوارینا وی بەرچاڤکرییە:

موئـان بەحروم كە دەر زەرف ئامە دۆستوم
موئـان نوقتە كە دەر حەرف ئـامە دۆستوم
بـە هـەر ئـەلفی ئـەلف قـەدی بەر ئایۆ
ئەلف قەدوم كە دەر ئەلف ئـامە دۆستوم

( ئەڤ چوارینە بۆ ژبەركرنێیە )

ئـانكو: ئەز وەكی وێ دەریایێ مە كو دپەیالەكیدا دەركەفتیمـە، ئـەز وەكـی وێ خالێ مە كو ل دەسپێكا پیتەكێ پەیدا بوویم، پشتی هـەر هـزار سـالاْن ئەلف ئەندامەك دەردكەڤیت، ئەز ئەلف ئەنـدام و بـەژن راسـتێ وەكـی ئـەلفم كـو د ئـەلفێ دا (هـزارێ دا) هاتیمـە دونیـایێ، پاشـی میـرزا مەهـدی خـان ددێرا دوماهییێ دا لیـەی ژمـارێن ئەبجـەدی شـروڤەكرییە، كـو سـالاْ ژدایك بوونـا بابــەتاهرێ دكەڤیتــە ٣٢٦ ێ مشــەختێ كـو بەرانبـەر (٩٣٨ز)یـە، هەروەسـا سـالاْ ٤٠١ ێ مشـەختێ دانایـە ب سـالاْ مرنـێ . . . لێ چ بەلگـە نەئینایـنە كو بەرانبەر(١٠١٠ز)یە، هـەر چەوا بیـت چـەند سالێ كێمتـر یـان زێـــدەتر چ ژ بهـــایی هۆزانڤانییـــا بابـــەتاهری كـــێم و زێدەناكـــەت كـــو هۆزانڤانەكی سۆفی و خودێ نیاس بوو د سەردەمێ خۆ دا.

## بـــەرهـــەم:-

ئەو بەرهەمێن ئەدەبی یێن بۆمە ژ بابەتاهری مایین كومـەلاْ چوارینێن وینـە كو زۆر ب هێزبوون و جهـێ خۆ ددل و دەروونـێ خەلكیـدا كربوون و ژبەركرینە، ژ بەرەبابەكی بۆ بەرەبابەكی مانە ڤە یان هاتینە ڤەگوهاستن تـا گەهشتینە سـەردەمێ چاپكرنێ، پاشی ددیوانـەكا بچویكدا چـەند جاران هاتییە چاپكرن، لێ پتریا چوارینێن وی كو هاتینە چاپكرن دەستكاریەكا زۆر تێدا هـاتییە كرن و پـەیڤێن فـارسی دگـەل تێكەل كرینـە ، هـەروەسا

جوّبار: جوّگ.

جوّشش: هەلاڤێتنا ئاڤێ ژ کانییێ.

سوّزی دڵمە: دەردێ دلێ منە.

تـاو: هـێز (تاوی گریان = هێزا گریانێ).

سەبەبی جوّششی ئاوە: ئەگەرێ کەلینا ئاڤێ یە.

مانی (٢١٦ – ٢٧٧ز) وێنەکێشەکێ بلیمەت و زانا دانەرەکێ بێ هەڤکویف بوو. خوّ ب پێغەمبـەرینییێ دەرئێخسـن، ژبـەر ڤـێ هـزرێ زینـدان کریـە، و ژ ئەگەرێ ئەشکەنجەدان و نەخوّشییێ وەغەرکریە.

ئەم قەوسە: مەبەست پێ (بری) یە.

موتەنەفیس: گیاندار . ئادەمیـزاد . ئەوێ نەفەسێ دکێشیت.

شەککربار: زوّر شیـرین.

ئینشا دەکا: دروست دکەت ، یان جوان دنڤیسیت.

لە عەمدەن: ب عەمدی ، ب ئەنقەست.

شەهسوار: سوار چاك . شاسوار.

زبـانی: زمـانـی.

خوّکردیە: تشتەك ژلایی نەشارەزاییەکی هاتبیتە کرن.

نادان: نەزان ، بێ عەقل.

کوتاڵ: قوماش.

سەودا دەکا: دکڕیت و دفروّشین.

دەعـوا: ڕاوەستیان ل بەرامبەر.

هەودا: کولاڤ.

قەسووەت: سەخت ، ڕەقی.

نەبوو ڕووم: شەرمزار نەبووم.

مولەوەس: پیس.

ئاوی زەرقا: ئاوی ئاسمان.

ناسیە ماحی: ناڤ چاڤان.

دەرماندەر: بێ چارە ، بێ شیان و بێ هێز.

دەری ڕەحمەت: دەرگەهێ رەحمەتێ.

تەن: لەش.

ئیفتا دەی: کەڤتە ناڤ.

شەپۆڵ: پێل.

سەیل: لێمشت ، لێسەر

دەوری نەدا: نە زڤری ڤە.

کەوکەبە: ستێرا گەڕۆك.

میهر: دلسۆزی ، ڕۆژ.

تەم: مژ.

چەمەن: کەسکاتی ، چیمەن.

ئارا نەبوو: جوان نەبوو.

پیرانەسەر: سەردەمێ پیراتییێ.

ئەسلی درەخت: ڕەهـا دارێ.

خورڕەم: تەڕوتازە.

بالانەبوو: بلند نەبوو.

سلێمانان: کوڕێ (سلێمان) پاشای.

سەدری: پێشەوا.

تەختێ ئاخیرەت: تەختێ حوکمڕانییێ، یان تەختێ ل سەر دروینن و رۆژا ئاخرەتێ موحاسەبێ دکەن.

ئەحمەدی موختار: ئێکە ژ ناڤێن پێغەمبەری (س).

تەخت ئارا: تەختێ رازاندنێ.

قیسـە: حیکایەت ، چیرۆک.

عـەدیـل: هەڤلنگ.

مـورغ: باڵندە.

عـالـی فیترەتە: سروشت بلند و پـاکە.

ڕەوەز: گولستان ، بـاخ.

جەنەتولمەئوا: بەهەشتا حەفتێ ، خۆشترین بەهەشت.

موسـبـەت: تشتێ خۆ گرتی ، جهگر.

عـالـی جا: جهـێ بلـنـد.

| | |
|---|---|
| خالی جا: | جهیٚ بەتال. |
| جەم جا: | پایە بلند. |
| ئەسکەندەر: | ئەسکەندەریٚ مەقدونی کو ل ٣٣١ پشتی زایینی لە شکریٚ (دار)ی ل نزیکیٚ هەڤلێریٚ شکاند. |
| جەم جانە بوو: | پایە بلند بوو. |

# دەسپێکا پەخشانا کوردی

ئاشکەرایە کو دابەشکرنا ئێکێ یا ئەدەبیات ئەوە کو ئەدەبێ دکەتە دوو بەش، (شیعر) و پەخشان، دبەحسکرنا ئەدەبیاتێ عەرەبی ئەو چەند بو تە دیاردبیت کو شیعر پێش پەخشانێ دکەڤیت و بەری وێ پەیدابوویە، دیارە ئەڤ یاسایا گشتی لسەر ئەدەبیاتێ کوردی ژیدا بجە دهێت، دکوردیدا شیعر گەلەك پێش پەخشانێ کەفتییە، بەلێ وەك دیاردەك ل سەدێ نوزدێ پەخشانا کوردی پەیدابوویە.

ئەدەبیاتناسێ کوردی، دەمێ دهێتە سەر بەحسکرنا پەخشانا کوردی، (مەولودنامە) یا شێخ حسێنی قازی (١٧٩١ - ١٨٧٠) ب دەسپێکا ڤی بابەتێ ئەدەبی د دانیت، چنکو هەتا نوکە بەرهەمەکێ دی بدەست نەکەفتییە کو بەری ڤێ پەخشان هاتبیتە نڤیسین، ئەڤ کتێبە پێکهاتییە ژ ڤەگێرانێ و دهێتە سەر بەحسێ ژ دایك بوونا پێغەمبەری (س.خ) پاشی چەند چیروکەکێن کورت لدور مفا و مەزناهیا مەولید خواندنێ ڤەدگێریت ژلایێ زمان ڕووخسارێڤە، بهایێ ڤێ کتێبێ دهندێدایە:-

١- ب پەخشان هاتییە نڤیسین.

٢- نموونەکە بو (سەجع)ا کوردی.

٣- ب ڕەنگەکێ سادە حیکایەتێ یان چیروکێ ڤەدگێریت.

٤- زمانێ وێ یێ کوردی هەر ئەو زمانێ تێکەلە ئەوە ئەدەبیاتێ قوتابخانا کلاسیکی پێ هاتییە نڤیسین، هەر چەندە ل گەلەك جهاندا نڤیسەری دەسپێکەك بو نڤیسینا کوردی یا پەتی دانایە، پەیدابوونا پەخشانێ ب ڤی رەنگی و هەر ل بازێرێ سلیمانییێ ب پشکەکێ دهێتە دانان ژوێ هێزو سەرهلدانا وی سەردەمی ل میرگەها بابان دهاتە دیتن،ئانکو ئەو ئەگەرو دەست و دارێ قوتابخانا (نالی) بەردەست کری.هەر ئەوژی بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا پەخشانا کوردی.

**نموونە:**

لڤێرە ئەم دشێین نموونەکا جوان یا نڤیسینا کوردی تۆمار بکەین، شێخ حسێنێ قازی، پشتی بەحسێ گوهـ لێبوونا مزگینیا ژدایك بوونا پێغەمبەری (س . خ) دکەت، دبێژیت: ((دەرگای بەهەشت کرایەوە، دەرگای جەهەنەم داخرا، گوڵێ بەهەشت خوشحاڵ بوون، درەخت سوور بوون، کانی بەحەوز بوو، خونچە دەمی دایەوە، کانیی وشك ژیاوە، تەیران هەموو هاتنە خرۆش، سەرچاوە هاتنە جۆش، حۆریان گرد بوون، ویلدانی بەهەشت شەرابەن تەهووریان نۆش کرد، بولبول مەست بوون لە سەر چڵان، نەسیم وەربوون بەنێو گولان، گولاڵە سوور بوون، کەو سەر سەرکەوت، زیخی دەرکەوت جۆگەی پڕ بوو، وشکیی تەڕ بوو چیمەنی شین بوو، نێرگز رەنگین بوو، گوڵی گەش بوو، وەنەشە ڕەش بوو، نێرگز پشکوت، گیای بزووت، درەختی هاتە میوە، کەوتە دەر، قەسری موزەییەن کرا، ساحیبی موعەییەن کرا، فەرشیان ڕاخست، عەرووسیان داخست، هەوا مەعەتەر بوو، بۆن خۆش زۆر بوو . . . .)).

(ژ دەسپێکێ بۆ ژبەرکرنێیە هەتا (کانی وشك ژیاوە)

**ڕاڤەکرنا پەیڤان:**

| | |
|---|---|
| دەرگا | : دەرگەهـ |
| کرایەوە | : ڤەکرییە |
| درەخت | : دار |
| خونچە | : بشکوژ |
| خرۆش | : هژیان / لڤین |
| جۆش | : پەقی / زان |
| تەهوور | : پاقژ |
| نۆش کرد | : ڤەخوار |

چلاّن : تـا (تايىّ دارىّ)

نەسيم : كزەبا

گولاّلّە : بيتانوك

زيخ : شيشەبەرك

چيمەن : ميّرگ

وەنەوشە : بنەفشوك

پشكوت : بشكڤى

هـەر ل وى دەمـى بەرهەمـەكىّ دى ل ژوّريـا كوردسـتانىّ ب پەخشـان هاتـە نڤيسـين، ئـەو ژى كتيّبـا (عـادات و رسـوماتنا مـەى ئەكرادیـە) كـو زانـايىّ كورد مەلا مەحموود بايەزيدى ئەوىّ ل دەوربەرىّ سالاّ ١٧٩٩ ژدايك بووى نڤيّسييە، ئەو كتيّب ل سالاّ ١٨٥٨ هاتيە نڤيسين.

ئـەڤ كتيّبـە نموونـەيا زمانـەكىّ ئاسايى و سادەيى كوردى يـىّ ديالیّكتا كرمانجييـا ژوّريـە. بەحسـىّ رەوشـت و تيتـالّ و ژيانـا نەتەوايـەتى و كوّمەلاّيـەتيا كـورد دكـەت، دەستنڤيسـا كتيّبـىّ ل كتيّبخانـا گشـتى (لينينگراد) هـەتا سالاّ ١٩٦٣ هـاتبوو پاراسـتن هـەتا وىّ سالّىّ ب زمانىّ كـوردى و ب وەرگيّرانـەكا رووسـى وب پيّشـەكيا (مارگريـت روّدينكـوّ) ل مووّسكوّ هاتە چاپكرن.شيّوەيىّ ڤىّ كتيّبىّ وىّ بو مە دەردئيّخيت كو پتـر بـو زانـين و بيـرهاتنا كەسايەتى هاتبيتـە نڤيسـين، چـونكو نڤيسـەرى ب ئاخفتنـا روّژهەلاتناسـىّ رووسـى (ئەليكسـەندەر ژايـا) نڤيسـييە و بـوّ وى نڤيسييە،

ئەڤجا هەر چەوابيت ژلايىّ توّماركرنا رەوشت و تيتاليّن كوردان، تشتـەكىّ بهادار بومە بجه هيّلايـە ونڤيسينا پەخشانا وى ژى هـەر چـەندە مەبەستا نيشادانا ئەدەبى تيّدانينە، بەلىّ ويّنەيەكى سادەيىّ نڤيسينا كوردى بوّ مـە بجه هيّلايە.

## نموونەیەك:

(عادەتێکی دن ژی ئەوان ئەکرادێت خۆ جەهی هەین، زڤستانان وەکو دێنە مەجلیس ئەو دکەنە گەڕەلاوژ، گەڕەلاوژ تا وەکو هەر چەندە مرۆڤ د وی مەجلسیدا حازر هەین، ماقولێ و مەزن و بچووك، حەموو دێ هەر یەك بەندەکی ئستڕانی لابود بە بێژیتن، ژ سەرێ مەجلسێ دەستپێدکەن هەتا دووماهییا مەجلیس، شایەد وەکو مێوانەك دوی مەجلیسی پەیدا بەبتن بێچارە بە ئەلبەتە ئەو مێوان ژی دێ بەندەکی ئستڕانێ ژ بۆ وان ببێژیتن، نەگوتی ئەلبەتە نابتن. ئەو ئەکراد ژی ڤی بەندا ئستڕانێ ڕاگیسك دبێژن، ئەلبەتا مێوان ژی دێگیسکە مەجلیسی بدەتن).

(ژ دەسپێکێ بۆ ژبەرکرنێیە هەتا (دووماهیا مەجلسی)

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| دن ژی: | ئەوێ دیژی. |
| خۆ جەهی: | خۆ جە. |
| گەڕەلاوژ: | تێکەلی. |
| بەندەك: | پارچەك. |
| ئستران: | ستران. |
| مێوان: | مێڤان. |

بێگومان ئەڤ کتێبا مەلا مەحموودێ بایەزیدی کار نەکریە سەر پێشڤەچوونا ئەدەبیاتێ کوردی، چنکو ل دەمێ خودا نەهاتبوو بەلاڤکرن، هەتا لبەر ژی نەهاتبوو نڤیسین و هەر ئەو دەستنڤیس هەبوو کو ل ڤێ دوماهیێ هاتیە بەلاڤکرن.

بەلێ بزاڤا ئازادیخوازا کورد ل سالێن دوماهیێ یێن سەدێ نوزدێ، ئەگەرەکێ دی بو خەبات ورەنگەکێ دی بو دەربڕینا هزرا سیاسی و کۆمەلایەتیا خۆ دیتەڤە کو ئەو ژی ڕۆژناما کوردییە.

ڕۆژناما کوردی، یا وی سەردەمی و نوکە ژی زۆر شێوەیێن ئەدەبی هەنە، هەتا دنڤیسینێن سیاسی ژیدا شێوازێ ئەدەبی دەسەلات لنك نڤیسەران هەبوو. ژبەر ڤێ چەندێ پەیدابوونا ڕۆژنامەڤانیا کوردی ب دەسپێکا گەشکرنا پەخشانا کوردی دهێتە زانین، ئێکەمین ڕۆژنامەیا کوردی، ڕۆژنامەیا (کوردستان) بوو، کول ل ڕۆژا (٢٢)ێ نیسانێ ١٨٩٨ل قاهیرە (میقداد مەدحەت بەدرخان)ی دەردئێخست و پاشی ل جنێف و ئەستەنبوول دهاتە دەرئێخستن، پشتی ڤێ گۆڤارا (ڕۆژی کورد)ل ئەستەنبوول ل سالا ١٩١٣ هاتە بەلاڤکرن، پاشی ڕۆژنامەیا (بانگی کوردستان) هەر ل ئەستەنبوول سالا ١٩٢٢ هاتە بەلاڤەکرن.

پێچ پێچە دگەل دەرکەفتنا ڕۆژنامە و گۆڤارێن نوی، پەخشانا کوردی دەست ب گەشەکرنێ کر. بابەتێ نوی یێ پەخشانێ پەیدابوو، ژ گۆتارا سیاسی کو ب شێوازێ ئەدەبی دهاتە نڤیسین بو گۆتارا کۆمەلایەتی و پارچەیا ئەدەبی، هەتا ڕۆژانێن حاکمداریا شێخ مەحموودێ نەمر، چیرۆکا کوردی سەرهلدا، چیرۆکا چەند بابەت و چەند پلەیێن خۆ هەنە،هەر دگەل چیرۆکێ گۆتار ژی بەرف پێش چوو.

# مێژوویا رۆژنامەڤانیا کوردی و پەیوەندی ب گەشەکرنا پەخشانا کوردیڤە هەتا شۆرەشا ١٤ی تەمووزا ١٩٥٨ ل عێراقێ

## سەرهلدان و کوردستانا دایك:

ژکەڤن وەرە هەتا دوماهیا سەدێ نۆزدێ زمانێ کوردی تنێ زمانێ گفتوگۆ و شیعر بوو نەك نڤیسینا پەخشانێ، ژبەر وێ چەندێ دەرکەفتنا رۆژنامەیا ((کوردستان)) گرنگیەکا تایبەتی هەیە د مێژوویا زمان و ئەدەبێ نەتەوەییێ مەدا، چنکو رۆژنامە لایەنەکێ گرنگ و کاریگەرێ ژیانا رەوشەنبیرییە و دیاردەکا شارستانی و پێشکەفتنێیە، نیشانا هشیاریا نەتەوەیە، دیارە ((کوردستان))ل (٣٠)ی زیلقعیدە سالا (١٣١٥)ی مشەختی بەرامبەر (٢٢)ی نیسانا سالا (١٨٩٨)ز ل بازێرێ (قاهیرە) ژلایێ (میقداد مەدحەت بەدرخان) نەڤیێ (بەدرخان پاشا) دەرکەفتیە، پاشی ژلایێ (عەبدولرەحمان بەگ)ێ برایێ وی دەرکەفتییە.

رۆژنامەیا کوردستان دچوار سالێن ژیێ وێ (٣١) ژمارە ژێ هاتینە بەلاڤکرن، چنکو ژمارا دوماهیێ، ژمارا (٣١) بوو کو ل (٦)ی موحەرەما سالا (١٣٢٠)ێ مشەختێ بەرامبەر (١٤)ی نیسانا سالا (١٩٠٢)ز دەرکەفتیە، ئەڤ (٣١) ژمارە ژی ل ڤان جهان دەرکەفتن:- قاهیرە و جنێف و لەندن و فۆلکستۆن، رۆژنامە ب زمانێ کوردی شێوەزارێ کرمانجیا ژۆری (زاراڤێ جەزیرا بۆتان) بوو، پشکەکا ڤێ رۆژنامێ ب زمانێ تورکی بوو، دا کاربەدەستێن ئوسمانی دداخازێن رەواێن مللەتێ کورد بگەهن.

رۆژنامێ گرنگیەکا زۆر ب ئەدەب و مێژو و خویندن و خوێندەڤانیێ دایە، هەروەسا بزاڤ کریە کو کوردان هشیار بکەت و هزرا نەتەوایەتیێ د

مەژیێ کوردا بچەسپینیت، داخازا بەرهنگاربوونا زوڵم و زۆرداریێ کریە، پتریا بابەتێن وێ ب پەخشان هاتینە نڤیسین.
ئەڤێ ڕۆژنامێ رێ خۆش کر کو پشتی وێ کاروانێ رۆژنامەڤانیا کوردی بەردەوام بیت رانەوەستیت، هەر چەندە زمانێ رۆژنامێ و رۆژنامێن پشتی وێ، زمانەکێ رەهوان و کوردیەکا پەتی نەبوویە، پەیڤ و زاراڤێن عەرەبی و فارسی و تورکی تێکەلبووینە، بەلێ پشتی هینگێ رێ خۆش بوو بۆ بکارئینانا زمانێ کوردی یێ پەتی و بژارەکرنا زمانێ نڤیسینا پەخشانا کوردی. هەروەسا بەردەوامبوونا ڕۆژنامە و گۆڤار ب زمانێ کوردی رێ خۆش کر کو چیرۆکا کوردی سەرهلدەت و پیچ پیچە پێش بکەڤیت، ئەڤە ژی دەقەکە ل خارێ و دێ ب رێنڤیسا ئەڤرۆ د نڤیسین کو دژمارە (٥)یا ڕۆژا پێنج شەمبی (٢٧)ی موحەرەما سالا (١٣١٦)ێ مشەختی هاتیە بەلاڤەکرن:
(ژ بۆ جەریدەیا کوردستانێ)
حەیفا مە گەلەك ژ کوردێ مەرە دهات، من رۆژ و شەڤ گازند دکرن.چڤا کرمانج هەنە حەمی مێرو ژێهاتینە، چرە هولێ بێ مەعریفەت و سنعەت مانە، نڤیساندن و خوندنا حەمی کوردا چرە نینە، ئەز لناڤ ڤان کول و دەردا ژارو کالێ ببیم حەیری مابیم، نهۆ ژ خودێ تەعالا شوکر دکەم ئەو جەریدەیا تە لسەر قنجیا کوردا دەرئێخستی یا تە ژمەرە رێکری، هات وکەتە دەست من، حەچکو چڤا مراد من هەبێن حاسل بێن قنجی یێ لسەر دنێدە حوقادبت مەزنایی لڤی زمانی حوقا چێ دبت، وەکی ئەو جەریدە من خۆند ئەز دەرحەڤا دوعا و مەدحێ تە حەیر مام، ئەز ژ خۆندنا وێ تێرنەبیم، من گازی کوردو کرمانجیا کر، ژوانرە خۆند ئەوژی گەلەك شابین، بەلکە ژ شابینێ لال بێن، لناڤ بەینا دوو سێ رۆژادە حەق بیست جەریدە یان دان هەڤ و ژمرا ئانین.
(ئەڤ دەقە ژ دەسپێکێ هەتا (حاسل بێن) بۆ ژبەرکرنێیە)

## بەرەڤ چەسپاندنێ ل ئەستەنبوول

ل دەسپێکا سەدێ بیستی ل باژێرێ (ئەستەنبوول) پایتەختێ دەولەتا ئوسمانی چەند رێکخراوەکێن ئازادیخواز کەتنە بزاڤ و خەباتێ بو بەلاڤەکرنا هزرا ئازادی، بو ڤێ مەرەمێ دەست ب بەلاڤەکرنا چەند رۆژنامەو گۆڤارا کر، ژوانە کۆمەلا (تەعالی تەرەقی کوردی) وکۆمەلا (هیڤی) یا کوردی کو ژ رەوشەنبیرێن کورد پێن دیاربەکر و وان و سلێمانێی و هەولێر و کەرکووك و مەهاباد.... پێکهاتبوو کو ب گیانەکێ نەتەوەیی چەند گۆڤار و رۆژنامە ب زمانێ شرینێ کوردی دەرئێخستن، کۆمەلا (هیڤی) ل سالا ۱۹۱۳ چوار ژمارە ژ گۆڤارا (رۆژی کورد) دەرئێخستن و بەرگێ هەر ژمارەکێ ب وێنەیێ مرۆڤەکێ ناڤدارێ کورد هاتبوو خەملاندن، ئەڤ گۆڤارە ژلایێ (عبدوالکریم ئەفەندی) خەلکێ سلێمانیێ هاتە بەلاڤەکرن. گۆتارێن ڤێ گۆڤارێ ب هەردوو شێوەیێن کرمانجیا ژۆری و کرمانجیا خارێ هاتبوونە بەلاڤەکرن. ئەڤ گۆڤارە کو ب ئێکەمین گۆڤارا کوردی دهێتە دانان، ئێکەمین چیرۆکا کوردی ب ناڤێ (شەویش) بەلاڤەکر. پشکەك د ژمارە (۲)دا و پشکا دی دژمارە (۳)دا ب ناڤێ نڤیسەر (فوئاد تەمۆ)یە کو چیرۆکەکا سادە و نێزیکە ژ سەرهاتێن کوردی و ب شێوەیێ کرمانجیا ژۆری هاتیە نڤیسین. هەر دوان سالاندا رۆژنامەیا (کوردستان)ل ئەستەنبوول ژلایێ (سورەیا بەدرخان) هاتیە دەرئێخستن، هەر وەسا گۆڤارا (ژین) و (هەتاوی کورد) و گوڤارا (کوردستان) سالا ۱۹۱۹ ب زمانێ کوردی و تورکی دەرکەفتن.

## ( ڕۆژنامەڤانی ل سەر دەمێ حاکمداریا شێخ مەحموود )

پشتی ب دوماهی هاتنا شەڕێ ئێکێ یێ جیهانێ وب ئەگەرێ سەرهلدانا شۆرەشێن شێخ مەحموودێ نەمر، بازێرێ (سلێمانیێ) بو مەلبەندێ رەوشەنبیریا کوردی، پاشی ب ئەگەرێ دامەزراندنا حکومەتا کوردستانێ ب سەروکاتیا شێخ مەحموود ل سالا ١٩٢٢ کۆمەڵەکا ڕۆژنامەیان ب زمانێ کوردی دەرکەفتن، بێگومان پتر رێ خۆشکر بو گەشەکرنا ئەدەبیاتێ کوردی ب گشتی و چیرۆکا هونەرێ کوردی ب تایبەتی. ئەو بوو ڕۆژنامەیا (بانگی کوردستان)ل بازێرێ سلێمانیێ (١٤) ژمارە ژێ دەرکەفتن ژمارا ئێکێ ل (٢)ی تەباخا ١٩٢٢ز دەرکەفت، هەروەسا ڕۆژنامەیا (ڕۆژی کوردستان) دناڤبەرا سالێن (١٩٢٢ – ١٩٢٣) ، (١٥) ژمارە ژی دەرکەفتن، ئێکەمین ژمارە ل (١٥) چریا دووێ سالا (١٩٢٢) دەرکەفتن، سەرنڤیسەرێ ڤێ ڕۆژنامێ شاعیر و نڤیسەر (عەلی کەمال باپیر) بوو، بەری ڤان هەردوو ڕۆژنامەیان ئنگلیزا ل بازێرێ سلێمانیێ ڕۆژنامەیا (پێشکەوتن) دەرئێخست کو حەفتیانە دەردکەفت. ئێکەمین ژمارە ل ڕۆژا (٢٩)ی نیسانا سالا (١٩٢٠) هاتە بەلاڤەکرن. پاشی ژلایێ پیرەمێردێ نەمر ڕۆژنامێن (ژین) و (ژیان) و (زبان) و (ژیانەوە) ب بەردەوامی دەرکەفتن هەتا سالێن پێنجیا، ئەڤێ شاعیرێ مەزن و ڕۆژنامێن وی ڕۆلەکێ بەرچاڤ دیت د ڤەژاندنا کەلەپوورێ نەتەوەیا کورد وپێشڤەبرنا چیرۆکا کوردی، ئێکەمین چیرۆکا کوردی کو ب شێوەیێ کرمانجیا خارێ هاتیە نڤیسین ب ناڤێ (لەخەوما)یە کو ژ لایێ (جەمیل

سائیب)ڤە ب زنجیرە ل رۆژنامەیا (ژیانەوە) دهاتە بەلاڤەکرن، ئەڤ چیرۆکە بەحسێ سەردەمێ شێخ مەحموودێ نەمر دکەت، بەلێ ژبەر چەند ئەگەرێن تایبەت و کەسی ب خەوەکا نەخۆش دهێتە دانان، کو ئەڤە ژی دگەل داخازیا پتریا کوردان ناگونجیت، چنکو بێگومان سەردەمێ شێخ مەحموود لنك هەر کوردەکێ دلسۆزو نیشتمان پەروەر ب خەوەکا خۆش دهێتە دانان، چیرۆك ژ لایێ زمان و هونەریڤە یا سەرکەفتیبوو، بەلێ ژلایێ هزرو ناڤەروکێڤە ب سەرکەفتیانە ناهێتە دانان، ئەڤەژی نموونەکە ژ نڤیسینەکا د ناف رۆژنامەیا (بانگی کوردستان)دا کو پێکهاتیە ژ فەرمانەکا شێخ مەحموودێ نەمر کو دژمارا (١٠)دا یا سالاً وێ یا ئێکێ ئانکو ل ڕۆژا ئێك شەمبی (٢٣)ی سەفەری ١٣٤١ مشەختی و (١٥)ی کانینا ئێکێ ١٩٢٢ هاتیە بەلاڤەکرن.

((سوڕەت ئیدارە، عەلیەهی، حەزرەت حکومدار لە مەملەکەتی سلێمانی دا نووسراوە، لە مەحموود ئیبن سەعید بۆ کافەی میللەت کورد)) لە پاشی تەڵەبی سەعادەت و مەغفەرەت لە بارەگای ئەحەدییەت بۆ ئەم میللەتە مەزڵومەی خۆمان ئیعلان دەکەم، کە لەبەر بەعزێ ئەسباب و عەوارزی سیاسیەوە موددەتێکە لە خزمەتی ئەم میللەتە سادقەی کوردە دوورو مەهجور مابوون، ئیمڕۆ لە سایەی خودا ڕوحانیەتی (مصگفی) (صلعم).هیمەتی ئەجداد و لەسایەی نیازو (تفرغ) و قووەتی ئەم میللەتە سادقەوە گەیشتمە ئەم رۆژە موقەدەسەکە موەفەقەن هاتوومەتەوە، لە ئیمڕۆوە دەستم کردوە بەتە دویری پەروانەی حکومەت و موحافەزەی مەوجودییەت ئیستقلالیەتی کوردستان، ئومێدو ئارەزوو ئەکەم هەمووتان

بەیەك غایە و مەسلەك و بێ فاسلە سەعی بۆ دەوامی ئەم رۆژە و كۆشش بۆ تەعالی ئەم میللەتە ئەكەن.كورد وەكو یەك عائیلە مووتەفیقن وموتەحیدن لەگەل من دا بۆ تەحكیم و دەوامی ئەم حەقە سەریحەیەكە دەستمان كەوتووە، لازم و فرسەتە سەعی و غیرەت بكەین، ئەی میللەتم ئەمین بن كەزامنی سەعادەت و مووەفەقیەتی ئەقوام ئێتحاد و ئیتفاقە، وە میللەتیێ كە خوینێ ڕژتبێ بو حەقی خۆی قەتعیەن مەحروم و ئەسیر نابێ وەقەراری عالەمی مەدەنییەتیش ئەمەیە كە هەر قەومێ هەر عەنسورێ خۆی بەخۆی ئەبێ ئیدارەبكات، ئەوەلەن ئێمە كە میللەتی كوردین، سانیەن بۆ ئەم غایەیە قوربانیەكی زۆرمان دابە ئەو شەرتە كەیەك دڵ و یەك زبان و یەك وجودین، بەئیزنی خودا هیچ كەس زەفەرمان پێ نابات وە منیش تا ئاخر قەترە خوێن و ماڵی خۆم و ئەولاد و ئەتباعم بۆ سەعادەتی ئێوە سەرف كردوو وەتیكرار ئەكەم هیممەت لە ئێوە و مووەفەقیەت لە خۆدا.

حوكمداری كوردستان ( مەحموود )

(ژ دەسپێكێ بۆ ژبەركرنێیە هەتا (كۆشش بۆ تەعالی ئەم میللەتە ئەكەن)

## ڕۆژنامەڤانیا کوردی ل باژێرێ (هەڤلێر) و (رواندز)

ل سالا ١٩٢٥ هەتا ١٩٣٢ ل باژێرێ رواندزێ مەڵبەندێ پاشایێ گەورە و میرگەها (سۆران)، نەمر (حوسێن حوزنی موکریانی) گۆڤارا (زاری کرمانجی) دەرئێخست کو پڕ بوو ژ چیرۆکێن فۆلکلۆرێ کوردی و بابەتێن دیرۆکی یێن خۆش و کێم هاتینە بەلاڤەکرن. پشتی ڤێ ژی ل سالا (١٩٣٥) ل باژێرێ دێرینێ کوردستانێ (هەڤلێر) گۆڤارا حەفتیانە (رووناکی) دەرئێخست کو هەتا سالا ١٩٣٦ یازدە ژمارە ژێ دەرکەفتن، ئەڤێ گۆڤارێ ژی رۆڵەکێ بەرچاڤ هەبوو د پێشڤەبرنا ئەدەبیاتێ کوردی وپەخشانا کوردی ل باژێرێ هەڤلێرا وی دەمی.

## ڕۆژنامەڤانیا کوردی ل (بەغدا):

ل سالێن سیها و لدیفدا ئێدی باژێرێ (بەغدا) دبیتە مەڵبەندێ دەئێخستنا رۆژنامە و گۆڤار ب زمانێ کوردی، چنکو گەلەك کوردێ خویندەڤانێ زانکۆیێ ل ڤی جهی گەهشتنە ئێك، ئەڤجا دڤان سالاندا گۆڤارێن (دیاری لاوان) و (یادگاری لاوان) دەرکەفتن، پاشی گۆڤارا بەرکەفتی (گەلاوێژ) کو دنافبەرا سالێن (١٩٣٩ - ١٩٤٩) بو دەمێ دەه سالان ب بەردەوامی و بێ راوەستیان هەیڤانە ژمارەیەك ژێ دەردکەفت، دڤێ گوڤارێدا، نڤیسەر و شاعیرێن بناڤ و دەنگ (تەوفیق وەهبی) و (محەمەد ئەمین زەکی) و (عەلائەدین سوجادی) و (ئبیراهیم ئەحمەد) و (رەفیق حلمی) و (شاکر فەتاح) و (پیرەمێرد) و (گۆران) و (شێخ محەمەدی خالێ).....هتد گۆتارو شیعر بەلاڤەکرینە، سەردەمێ دەرکەفتنا (گەلاوێژ) ب سەردەمەکێ زێرین و ڤەژیندان و ڕابوون دهێتە دانان بو ئەدەبیاتێ کوردی ب گشتی و بۆ پەخشان و چیرۆکا کوردی ب تایبەتی،

هەروەسا بزاڤەکا بەرچاڤ یا وەرگێرانێ ژ زمانێن بیانی بو کوردی دەست پێدکەت.

ب تایبەتی ژ زمانێ ئنگلیزی، ب ڤێ چەندێ پەخشانا کوردی و چیروکا کوردی گەهشتنە گوپیتکێ. هەر ل سالێن ١٩٤٨ – ١٩٤٩ ل بەغدا گوڤارا (نزار) ژلایێ بەحەشتی (عەلائەدین سوجادی) حەفتیانە دەردکەفت و (٢٢) ژمارە ژێ دەرکەفتن ب زمانێ کوردی و عەرەبی، ب ئێکەمین گوڤارا سیاسیا کوردی دهێتە دانان. نڤیسەرێن وەك (شاکر فەتاح) و (پاکیزە رەفیق حلمی) و (موحەرەم محەمەد ئەمین) و (رەفیق چالاك) پشکدار تێدا کرییە.

ئەڤە ژی نموونەکە ژ پارچە پەخشانەکا (پیرەمێرد)ی ل ژێر ناڤێ (دواوانی زەڵم و تانجەڕۆ) کو دگەلاڤێژێدا ژمارە (٤)ێ (١٩٤٣) هاتیە بەلاڤەکرن:( ئۆخ، بۆیە ( مەولەوی )م خۆش ئەوێ شیفتە و شەیدای سۆزو ناڵەی ئەوم کە پەردە پەردە شوێنە شرینەکانی خاکەکەم ونشتمانەکەمی بە فەردی فەردەوە بەفرو زیبێکی دڵنەوەردەوە پیشانداوم بەسینەما خۆشەویستی ئەوانی چەسپاندوتە سینەمەوە ( کۆی ئاتەشگا )ی وەك ئاتەشگەدەی ( زەردەشت ) لێهێنامە تین و تاو: ئاو دلێ برژاندووم، تاڤگەی قەڵبەزەی ( زەڵم )ی وا بۆ کێشاوم دانەی مرواری بە سەردا پرژاندووم ( بارەکە الله ) چەرخ، هەی ئافەرین چەرخ پلووسکەی ( بافر )ی ( عەودالآن ) و هەوای ( چەمی خواجایی ) تێگەیاندم هەر ئەو جۆش و خرۆشە بووکە ( مەعدوومی )م لە دیاری ( عەدەم ) نەبووینەوە هێنایە سەرکۆی ئاتەشگاو پرشنگی شعرەکانیم خستە تەلی سازو سەمتووری شێوەی کوردی خۆمانەوە دام بە رادیۆی چابخانەی ( ژیان ) بەهۆی ئەو سەودای دڵبەستەی خاکەکەمانەوە هەر شوێنێکی رەنگین و هەر دیمەنێکی دڵنشین و هەر چەشمدازێکی شیرین و هەر لەنجەولارێکی ناوێکی نازەنین ببینم ئەمەوێ پێشانی هەموو دۆستێکی بدەم، بەلام ئاخ ( شیعر ) واتە هونراوە، نازانم تا چەند و چۆن ئەو زادەی سروشتێ ئێزەدییە بهۆنمەوە؟

(ژ دەسپێکێ... هەتا... بەسەردا پرژاندووم، بو ژبەرکرنێیە)

## ڕۆژنامەڤانیا کوردی ل شـــامـێ:

ل سـالێن ١٩٣٢ – ١٩٤٢ ل شـامێ و بـاژێرێ (دیمەشـق) گۆڤـارێن (هاوار) و (ڕۆژانوو) و (ستێر) و (ڕووناهی) ژلایـێ هـەردوو بـرا (جـەلادەت بەدرخان) و (کامیران بەدرخان) دەرکەفتن، ب شێوەیێ کرمانجیا ژۆری کو نڤیسـەرێن خـودان شـیان وەك (جگـەرخوێن) و (عوسمـان صـەبری) و (نورەدین زازا) و (قەدری جان)... هتد پشگداری تێدا دکر، ئەم دشێێن ڤی سـەردەمی ب سـەردەمێ چیـرۆکا کـوردی دانـین ب شـێوەیی کرمانجیا ژۆری، بو جارا ئێکێ ژی ل گوڤارا (هاوار) دەست ب نڤیسینا کوردی هاتـە کـرن ب پیتـێن لاتینـی، هەروەسـا ئـەڤان نڤیسـەران کۆمەڵـەکا چیـرۆکێن خۆش ب زمانێن فەرەنسی و ئینگلیزی کرنە کوردی.

## ڕۆژنامەڤانیا کوردی ل سەردەمێ کۆمارا کوردستان ل مەهـابـاد:

ل سـەر دەمـێ کۆمـارا سـاڤایا کوردسـتانێ ل بـاژێرێ مـەهاباد ل سـالا ١٩٤٦ بزاڤـەکا ڕۆژنامـەڤانیا کـوردی سـەرهلدا کـو ب سـەردەمێ زێرینـێ ڕۆژنامەڤانیێ دهێتە دانان ل کوردستانا ئیرانێ.

ئـەوبوو ڕۆژنامـەیا (کوردسـتان) و گۆڤـارێن (نیشـتمان) و (هەڵالـە) هـەتا ئێکەمین گۆڤارا زارۆکـان ب زمانـێ کـوردی ل ژێـر نـاڤێ (گروگـالی منـداڵانی کـورد) دەرکەفتییـە، ئـەڤان ژی ڤەژاندنـەك داپەخشـانا کـوردی، نڤیسـەر و شاعیـرێن خـودان شیان وەك (هـەژار) و (هـێمن) و (زەبیحـی) و (کـەریمی حوسـامی) و (حەسـەن قزلچـی) ب نڤیسـین و شـعرێن خـو یـێن خـۆش

پشکداری د ڤان ڕۆژنامە و گۆڤاراندا کرییە، ئەڤەژی پشکەکە ژ پارچەیا پەخشانەکێ کو د گۆڤارا (نیشتمان)دا هاتیە بەلاڤەکرن ژ لاییێ (ع . بێژەن) ڤە.

(نە، نە براکان خۆشەویستەکان وا گوێم لە ئاهو ناڵەی نیشتمانەکە بەکڕوزانەوە پێم ئەڵێ (ڕۆڵەگیان گریان کاری پیرێژنانە: تا دەرگای مردن و مراندن لەسەر پشتانە شیوەن و زاری ئیشی ناپیاوو پەستانە! خۆ ئێمەش خۆمان بەلاوێکی ئازا ئەزانین و مەعنای بەزین نازانین، کەوابوو بابچینە سەرچیا بلندەکانی نیشتمان بەگەوایی ئەوان پەیمانێکی برایەتی ببەستین کە وەکو ئەو چیایانە ڕەنگین، سەنگین بەخوێنی جەرگمان ڕەنگین بێ، بۆ گەلی هەژاری کورد، دوایی هێنی ژیانی نەنگین بێ ببێتە یارمەتیدەری ئێمە بۆ مردن و مراندن لە رێگای ڕزگاریدا)

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

ب هەلبوونا شوڕەشا (١٤)ی تیرمەهێ ل سالا ١٩٥٨ قۆناغەکا نوی ژ دیرۆکا رۆژنامەڤانیا کوردی دەست پێدکەت، چنکو ل وی دەمی و ب ئەگەرێ سەربەستیا بیرو بۆچوونا ل دەسپێکا شوڕەشێ کۆمەلەکا گۆڤار و رۆژنامە ب زمانێ کوردی ل بەغدا و هەڤلێر و سلێمانی کەرکووکێ دەرکەڤن کو لڤێرە پارتێن کوردی ژی ڕۆلەکێ بەرچاڤ هەبوویە د پێشڤەبرنا کاروانێ رۆژنامەڤانییێ و زمانێ کوردی ب تایبەتی پارتی دیمکراتی کوردستان و حزبا شوعی یا عێراقیێ.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| بایەخ | : گرنگی. |
| هەنگاو | : پێنگاڤ. |
| کوردی پەتی | : کوردی رەهوان ، پەیڤا بیانی تێدا نەبیت. |
| چڤا کرمانج هەنە | : چەند کورد هەن. |
| حەمی | : هەمی. |
| چڕە | : بوچی ، ژبەر چ. |
| هوٚ | : هوٚسا. |
| ژارو کال بیبیم | : هەژار و پیر بووم. |
| ژمەڕە رێکری | : بو مە هنارتی. |
| حەچکو | : هەچکو. |
| چڤا مراد من هەبی | : چەند مراد من هەبوون. |
| قنجی | : باشی ، چاکی. |
| لسەر زێدە | : لسەر دونیاییێ. |
| حوڤا دبت | : هوسا دبت ، ب ڤی رەنگی دبت. |
| ژوانڕە خوند | : من بو وان خواند. |
| ئەو ژیێ گەلەك شابین | : ئەو ژی گەلەك دلخوٚش بوون. |

ژ شابینیٚ : ژ خوٚشیان ، ژ دلخوٚشیان.

ژمرِا تین : بو من ئینان.

شیفەتەو شەیدا : عاشق و شەیدا.

پەردە پەردە : تەخ تەخ.

بەرفەرِو زیبیٚکی دڵنەوەردەوە : ب مفا و جوانیەکا دلخوٚش – فەر: مفا، خیٚر و بەرەکەت – زیب: جوانی – دڵنەوەرد: دلخوٚش

چەسپاندوٚتە سینەمەوە: دسینگیٚ من دا چەسپاند ، سینە: سینگ.

ئاتەشگا: ئاتەش ، ئاگر ، ئانکو جهیٚ ئاگر هەلکرنیٚ یان ئەو جهە ییٚ کو ل سەردەمیٚ (زەردەشت)ی ئاگر تیٚدا دهاتە هەلکرن وەك پەرستگەهـ بکار دهات.

قەڵبەزە : سولاڤ.

چەشمەنداز : دیمەن ، مەنزەر.

سروشتی ئیٚزەدی : سروشتیٚ خودایی.

بەکرِوٚزانەوە : ب دوعا کرن.

شیٚوەن و زار : گریان و فیغان.

بەگەوایی ئەوان : ب شاهدەیە وان.

سەنگین : گران.

ژیانی نەنگین : ژیانا شەرمزاری.

## مەلایێ باتەیی

ناڤێ وی (حوسێن)ە، ل گەندێ (باتێ) ل دەڤەرا هەکاریا ل رۆژهەلاتێ کوردستانا باکور ژدایک بوویە. ئەلکسەندەر ژاپا و گەلەکێن دی دوێ باوەرێدانە کو باتەیی ل سالا (٨٢٠)ێ مشەختی - (١٤١٧) ی زاینی ژدایك بوویە، ولدویف بیروباوەرێن هەین ل سالا (٩٠٠)ێ مشەختی - (١٤٩٥)ێ زاینی واتە ل سەدێ پازدێ وەغەرکرییە، هەرچەندە لدویف هزوربیرێن هندەك نڤیسەڤانان باتەیی ل سەدێ هەڤدێ چوویە بەر دلوڤانیا خودایێ مەزن. باتەیی ئێکە ژ ناڤدارێن هۆزانڤانێن کلاسیکیێن کورد کو ب زارێ کرمانجییا ژووری شعر و هۆزان ڤەهاندبیت، باتەیی ئێك بوو ژ مەلاییێن ناڤدارێن کورد و بەرنیاسترین بەرهەمێ وی (مەولودنامە) یە، دەرباری ژدایك بوونا (موحەممەد) پێغەمبەر (سلاڤێت خودێ لێ بن) گوتییە.

هۆزانڤانەکێ زمان سڤك و جەلەنگ بوو، جاران هۆزانێن ئاینی دنڤیسین جارانژی سازو چەنگ و دەف ل بەزمەیا خوێ ئامادەدکرن ل هیڤیا دلبەرا خوێ، جارانژی ل گوشەکێ خەراباتێ ڕونشتییە.

### مەبەستێن هۆزانێن باتەیی

باتەیی ڕێکا هۆزانڤانێن کلاسیزمی گرتییە" هەر ژ بەر هندێ ژی هۆزانێن خوێ بوێ ڤان مەبەستێن خارێ گوتینە:-

١- ئایینی و سوڤیاتی: وەکی هەمی هۆزانڤانێن کلاسیزمی ئەڤ مەبەستە لنك وی گەلەك گرنگ و بهادار بوویە" لەوما پشکا هەرە زۆرا دیوانا وی ئەڤ جوٚرە هۆزانە بخوڤە گرتییە . . . ل سەر گورێ پیروزی موحەممەد پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ لێ بن) ئەڤ هۆزانە گوتییە:

١- هـــلو رابه ئه‌بولقـــاسم

هلو ئه‌ی قاسدێ ئه‌كبه‌ر

٢- هـلو فه‌خرا به‌نی هاشم

هـــلو رابه تۆی ره‌هبه‌ر

٣- هلو ئه‌ی سه‌یدێ عالەم

هلو ئه‌ی مه‌فخه‌رێ ئادەم

٤- ژ ره‌وزێ رابه یا خاتەمی

ژناڤ وی مه‌رقه‌دێ ئه‌نوه‌ر

(هه‌می بۆ ژ به‌ركرنێیه)

٢- ئه‌ڤینـــداری: ئـه‌ڤ بابه‌تــه‌ژی هه‌رچـه‌نده هنـدیێ گـرنگ نییـه ل ده‌ڤ هۆزانڤـانی، لێ گه‌لـه‌ك جـاران تێكـه‌لی بابـه‌تێ بـه‌رێ كرییـه . . . پارچـه هۆزانێن ب نرخ ل ڤی بابه‌تی هه‌نه وه‌ك:

عاشـــقێ زولفـــا ره‌شم

عاشقێ شه‌یدایه زولـــف

بێ باده له‌و سه‌رخـــۆشم

سه‌رخۆش و سه‌ودایه زولف

سۆهتمه وێ په‌رچه‌مـــێ

چیمه‌كێ ره‌عنایه زولـف

٣- سالوخدانا جه واريێن كوردستانێ: ئەڤ هۆزانڤانە پەهلوان بوويە دوەسفكرنا سروشتێ كوردستانێدا، ئەو ئەڤيندارێ وەلاتێ خۆ بوويە، دڤێ هۆزانێدا دەمێن سالێ ل كوردستانێ بۆمە وێنەكريينە . . د بەحسێ زڤستانێدا دبێژيت:

١- زڤستانێ ئەڤێ هولێ
ل ڤێ بەرێ ل ڤێ چولێ
٢- مژێ هاڤێتە دا هولێ
كەروڤێ گرتی زوزانە
٣- كەروڤێ گرتی ئەسرینە
جەمەد شینبوو ل سولینە
٤- گريا مەتێ ژبۆ ئەسمینا
پەريشانم ل ڤێ حالەی

(سێ دێر ژ دەسپێكێ بۆ ژبەركرنێ)

٤- ساز و مەی و بەزم:

مەجلسا بێ ساز هەی پەی
من نەڤێت ئەز ناچمێ
بێ دەف وبێ چەنگ وبێ نەی
من نەڤێت ئەز ناچمێ
بەزمەيا بێ يارێ باتەی
من نەڤێت ئەز ناچمێ

(هەمی بۆ ژ بەركرنێيە)

باتـەیی وەکـی هـەمی هۆزانڤـانێن کلاسـیکی، هـۆزانێن خـۆ ل سەرکێشـا عـەرووزی دانایـنـە، هەروەسـا پویتـەکیٚ زۆر ب سـەروا و قـافییێ دایـە، پـەیڤێن بیـانی نەخاسمـە یـێن عـەرەبی زۆر بکارئینایـنـە و رەوانبێـژی و جوانکاری دڤەهاندنێن خۆدا بەرچاڤکرییە.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| هلو رابە | : هەستە |
| ئەبو لقاسم | : مەبەست پیٚ سەروەریٚ پیٚغمبەران موحەممەد (سلاڤێت خودیٚ لیٚ بن) |
| رەهبەر | : رابەر ، ریٚ نیشادەر |
| سەروەر | : گەورە ، مەزن |
| رەوزیٚ | : گولستانیٚ |
| بیٚ بادە | : بیٚ مەی ، بەبیٚ شەراب |
| سەرخۆشم | : سەرمەستم |
| تورا غەمیٚ | : توری خەم و خەفەت |
| سوٚهتیمە | : سوتیمە |
| رەغنا | : جۆرە گولەکە ، جوانە |
| بەرییٚ | : دەشت |
| مژیٚ | : تەم و مژ |

| | |
|---|---|
| کەروڤیێ | : باو بۆران ، باو بارۆڤە |
| نڤیسەڤانان | : نڤیسەران |
| جاران | : هەندیێ جار ، جار و بار |
| بەزمەیا خۆ | : لەبەزم و ئاهەنگا خودا |
| هۆزانڤان | : شاعر |
| گریا مەتیێ ژبۆ ئەسمینا | : (ئەسمین) گولەکە دارەکەوە دارا ئالینکیێ کولیلکا ویێ یا سپی یە |
| جەمەد | : بەستی |
| شین بوو ل سۆلینا | : مەبەست پیێ ئەو خوناڤا دسولینا هەر گولەکیێ دا بەستی بوو ، |

# حەسیب قەرەداغی

## ١٩٩٧ - ١٩٢٩

ناڤێ وی (حەسیب شێخ عەلی کوڕێ عبدولرەحمان)ە شێخ عەلی مەلا و ماموستایێ گوندی بوو، ل مەها گولانێ ١٩٢٩ز ل گوندێ (سوڵەی چرچەقەلا) سەرب دەڤەرا قەرەداخ ڤە دناڤ خێزانەکا هەژار و خویندەڤاندا هاتییە دونیایێ، ئەڤ خێزانە ژ بنەمالا شێخێت مەردوخیێن قەرەداغێیە، کو هەر دکەڤندا خویندەوار وزاناییێن ئاینی زەلامێن ناڤدارتێدا رابووینە، مزگەفت و جڤاتێن مەلا و فەقییان، جڤاتێن گەرم و گوڕییێن شێخان، تەسبیحا و خرڤەبوونێن دەرویشان، ستران و مەدیحە و دوعاییێن دەنگ خوشان، دەف و بلور و نەی، شعرێن سوار چاکێن، شعرا کوردی (نالی، کوردی، سالم و مەحوی) وشاعرێن مەزن یێن فارسی (سەعدی ، وحافزێ شیرازی)، خەما هەژاران و جوانیا سروشتی و بایێ زەلالێ دەڤەرێ . . ئەڤان و گەلەك سەروکانیێن دی بنیاتێ هزو بیر و سوزا
(حەسیب)ی دانا.

کودە تایا رەشا ١٩٦٣ یێ حەسیب قەرەداغی دگەل هزاران خەباتکەرێن دی کەتنە زیندانێ، دەمێ هاتییە ئازادکرن ژی ڤە نەگەریا سەر کارێ خوّ یێ بەرێ، د سالێن شەرێ نافخوّیی دا ئێك بوو ژ چالاکترین شاعر و زەلامێن ناڤدار کو هەردەم هەولا ئاشتیێ و ئاشتیکرنا لایەنان دکر . . هەتا ئێڤاریەکا سار و خوناڤگرتی ژ سالا ١٩٩٧ یێ دلێ وی یێ مەزن ژ لێدانێ راوەستا وغەرکرد ل گرێ سەیوان هاتە ڤەشارتن.

ئەڤە ژی دوو کوپلێن هۆزانێن وینە:-

١- پرس و خۆشەویستی یا ١٩٩١:

ویستم تێبگەم خۆشەویستی . . . چەند جوانە؟
( وەلـــــی ) وتـــی: بـــالآی ( شـــــــەم )ە
( مەم ) یش وتی: . . . زین وەری گرت. بەژنی ( مەم )ە
خەجیش وتـــــی: وەك زامەكـــەی ( سیامـــەند )ە
مامەیـار وتی: وەكو سەرگـــــور شتەی دوانز ســـــوارە
لەلای حەزرەتی ( مەولەوی )ش وەكو چاورەشی لای دەوار
لەلایی منیش وەكو دوو خەمە قورسەكەم . . . كەژە و بەهار
كوردیْ بانگیْ بەختی دەكرد: ئەریْ زووكە!
لە خۆشەویستی جوانتـریش، شارەكەرمەكەی كەركووكە

(هەمی بۆ ژبەر کرنێیە)

٢- پشكەك ژ هۆزانا ( ناكوكەكان ) ١٩٤٤:

كە ئەم دەستم ئەو دەستیكەم بۆ بشكێنیْ
هەردوو دەستم لەمل دەكەم!
كە ئەم چاوم ئەو چاوی دیم بۆ هەلْكوڵیْ
هەردوو چاوم پرگل دەكەم
ئەم ئاگرە بكوژیننەوە . . . نەكوژێتەوە
نالّی دەلیْ: من كـــورد نەبووم
حاجی دەلێت: من لە كۆیەدا نەژیـــاوم
قەت دیمەنی هەیبەت سوڵتان وەكو گولاْ و نەكراوەتە نێو چاوانم!

خـــانیٚ دەڵێ: مــــەم و زین، من نەمنووسیوە
من بەچاوی قەلەمیشم مێـرخاسی کوردم نەدیوە!
ســـالم دەڵێ: من دیٚوانە و ئابورای میـری دابان؟!
پیٚشـمـــــەرگەیەکی خــــەم لە کـوٚڵ دەلیٚت:
من و سەمفونیای، داستانەکەی چیـــای دابـــان؟!

(هەمی بۆ ژبەر کرنێیە)

بــۆ زانین:-

١- شـــاعری دهـــەمی بیاڤانـــدا شـــعر هەنـــە ژوان: شـــعرا هانـــدانیٚ (جوشـاندنیٚ)، دلـداری، تەسـەوف، سیاسـی، کوردایـەتی، سـالوخدانا سروشتی، جوانیا کوردستانیٚ، شعر بوٚ منـدالآن، شعر بوٚ شـانوٚییٚ، بوٚ دراما تێلەفزیونی بوٚ ستـران و سروودان.

٢- هــەتا نهـو چـەندین دیـوانێن شـعری هەنـە، ژوان: چـوار بــەرگێن (فەرهەنگی خەم).

٣- د گەرمـــە گــــەرما کارەســـاتا حەلەبچــــە یـــا شـــەهیدا هوٚزانـــا (هەلەبشیما) نڤیسییە.

٤- دگەرمـە گـەرما ڕاپـەڕینا مـەزنا ئـادارا (١٩٩١)یٚ و دگـەل بانگـەوازییا ئازادکرنـــا کـــەرکووکا دلێ کوردســـتانیٚ قەســـیدا (شـــێخ)ی هاتـــە خوێنـدن ب نـاڤ ونیشـانیٚ (مـن هـێچ نـاڵیم) کـو دوی دەمیـدا ببـوو زکریٚ سەر زمانیٚ جەماوەریٚ سەرهلدانیٚ کوردستانیٚ.

٥- دارشـــتنەکیٚ بنڤیســـە کـــو هـــەردوو بابـــەتێن شـــەڕو ئاشـــتییٚ بخوٚڤـــە بگریت.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| هەیبت سوڵتان | : چیایەکە دکەڤیتە نێزیك باژێرێ کویێ |
| مێرخاس | : پیاو چاك |
| ئاپورا | : شینی و تازی |

## کــــوردی

ناڤێ وی مستەفایە کوڕێ مەحموود بەگێ ساحێبقرانە، ب باوەریا وان کەسان ئەوێن لسەر ژیانا وی نڤیسی، ل سالا ١٨١٢ز ل بـاژێڕێ سلێمانێ ژ دایکبوویە، هەر ل سلیمانیێ دانایە بەر خواندنێ و هندەك زانستێن ئیسلامی ل حوجرەی فەقییان خواندییە.

کوردی ئێکە ژوان سێ هۆزانڤانێن بناڤودەنگ کو ڕۆڵەکێ گەورە گێرایە د ئەدەبییاتێ کلاسیزمی یا کوردیدا ب شێوەزارێ کرمانجییا خوارێ، د رەوانبێژییێدا شا سوارەکێ بێ بەرامبەر بوو، ل سالا

(١٨٥٠ – ١٨٥١)ز چوویە بەر دلوڤانییا خودێ ول گرێ سەیوان ل سلێمانیێ هاتییە ڤەشارتن.

کوردی، دیوانەکا کێم ب کوردی ل پشت خۆ بجە هێلایە، کو تا نهۆ دووجاران هاتییە چاپکرن، جارا ئێکێ ل بەغدا ل سالا ١٩٣١ز و جارا دووێ ژی ل هەولێرێ ل سالا ١٩٦١ز. پتریا هۆزانێن وی ل دەورێ تەوەرەکیدا زڤڕن کو ئەو ژی هۆزانێن دلداری و ئەڤینی و خوشەویستییێنە. کوردی جوانترین و بەرزترین هۆزان دئەڤێ مەبەستێدا ڤەهاندینە و هۆستایی و شارەزاییا خۆ تێدا دەرئێخستییە. بارا پتر بەرهەمێ کوردی ئەڤ جۆرە هۆزانەنە،نموونەیا ڤێ مەبەستێ ژی، ئەڤ چەند مالکێن هۆزانێنە:

١- چێشتم ئەمڕۆ ژەهری مارو ڕۆحی شیرینم نەهات
زەخمی کۆنەم هاتە ژان و مەرهەمی برینم نەهات
٢- من غەمم خواردو غەمیش خوێنی جگەرمی خوار
بۆیە گریام چەند بەچەند فرمێسکی خوێنیم نەهات

( بۆ ژبەرکرنێ یە)

## ڕوخسارێ هۆزانێن کوردی:

ئەگەر هویر بنێڕینە هۆزانێن کوردی، دێ بینین هەمی وردەکاری و شەکارییەك یا تێدا کو هۆزانڤانێن کلاسیزم مژوولی وان بوون و بکارئینانینە، ژبەر هندێ ژلایێ ڕوخسارێ هۆزانێن وی، ئەڤان چەند خالان دێ دیارکەین:

١- د هۆزانێن خۆدا وەکی هەمی هۆزانڤانێن کلاسیزمی کێشا عەرووزا عەرەبی بکارئینایە.

٢- هۆزانێن وی ئێك (ڕەویە) و ئێك سەروا هەیە.

٣- هەمی وشەکارییێن ڕەوانبێژیێ دهۆزانێن خۆدا بکارئینانینە، هەر ژبەر هندێ بوویە، هۆزانڤانێن پشتی وی ب چاڤەکێ بەرز تەماشەکرییە و ب (شاسوارێ بەلاغەتا کوردان) دانایە.

ئەگەر بەحسێ وان لایان بکەین کو کارکرییە سەر (کوردی) وب لایێ هۆزانێ و ئەدەبییاتا دا برییە، دشێین خالێن خوارێدا کۆم بکەین:

١- کوردی دسروشتێ خودا کەسەکێ بەهرەدار بوویە، هۆزان دانان ل جەم وی هند ب ساناهی بوویە وەکی ئاڤ ڤەخوارنێ بوو.

٢- کوردی ژ بنەماڵەکا ئەدەب دۆست و شیعرخواز بوو، ئەو بنەماڵ لاندکا شاعیران بوو یێن وەکی(ئەحمەد بەگ) و (سالم بەگ)ی، دیارە ئەڤەژی هۆکارەك بوو بۆ هۆزانڤانییا وی.

٣- ئاگەهدارییەکا باش وتێکەلییەکا زۆر ل گەل هۆزانڤانێن فارسی هەبوویە وگەلەك جاران ل کۆڕێن شیعری یێن ئەوان ئامادەبوویە و کارتێکرییە.

٤- ئاگرێ ئەڤینیێ و دلدارییەکا راستەقینە بوویە سەروکانییا ئیلهاما هوزانێ لنک کوردی و ئەڤ لایە ب هێزترین و کاریگەرترین هوکار بوویە، ژبەر هندێ بەهرا پتر ژ دیوانا وی گرتییە.

ئەڤە ژی نموونەیەکە ژ هوزانێن وی:

١- چاوەکەم زانیوتە بوچی خەو لە چاوم ناکەوێ
چونکە من پێش خزمەتم پێش خزمەتان نانوون شەوێ

٢- ڕوژ و شەو دایم لەبەردیدەی خەیالم حازری
ساچ فەرقێکی هەیە بومن ئیتر ئێرە و ئەوێ

٣- بەس نییە لێرە دەوێرم جار بە جار باست بکەم
نەم دەوێرا قەت لەبەر ئەغیارەکە ناوت بەم لەوێ

٤- دڵ لە بەر زامی فیراقت دائیما یاری دەکا
ڕوژ بە ڕوژ مەنعی دەکەم بازدەردی سەختە و ناسرەوێ

٥- عەقڵ و هوشم داوە پێت لێشی دەتورێی ماڵوێران
دەوڵەتێکی مفت وبی ساحیبە بوچی ناتەوێ

٦- گەرموخەییەربم لەمابەینی بەهەشت وەسڵی یار
وەسڵی تو بومن جەهەننەم پڕلەجەننەت نامەوێ

٧- ئەی ڕەقیب وێڵم لە دەستت لێرە بوڵێم ناگەڕێی
باوکە کوشتەت نیم ئەرێ هەی بەد مەزەب چیت لێم ئەوێ

٨- هەروەکو کێوی دەماوەندی سەرم پڕ شوڕشە
قەت تەمی هیجران و خەم ساتێ لە دەوری نارەوێ

٩- گەردنی ( کوردی ) لەکێوی بێستون مەحکەم ترە
چونکە سەد ساڵە لەژێر باری غەمایە نانەوێ

( دەسپێکێ چوار دێڕ بو ژبەرکرنێ نە )

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| چێشتم | : من تام کر ، من خوار. |
| زەخم | : برین. |
| دیدە | : چاڤ. |
| دەوێرم | : دوێرم. |
| ئەغیار | : دوژمن. |
| بازدەری سەختە | : بەلێ دەردێ وی یێ گرانە. |
| ناسرەوێ | : ڕاناوەستیت ، ناسەکنیت. |
| لێشی دەتۆرێی | : ژ وی ژێ سل دبی ، ژوی زیز دبی. |
| مفت | : بەلاش ، هەروە ، بێ بەرامبەر. |
| وەسڵی یار | : گەهشتن ب دلدارێ. |
| باوکە کوشتەت نیم | : من بابێ تە نەکوشتییە. |
| مەزەب | : ئۆل ، مەزهەب. |
| کێوی دەماوەند | : چیایەکێ سەخت و بلندە دکەڤیتە پشت (تاران)ێ پایتەختێ ئیرانێ. |
| کێوی بێستوون | : چیایەکە ل نزیك(کرماشان) ل کوردستانا ئیرانێ. |

# كـــانـــى

(كانى) نازناڤىَ هۆزانڤانىَ كلاسيزمىَ كوردى، عبدولجەبار ئاغايىَ كورِىَ حاجى مەلا عبدولرەحمانىَ كورِىَ حاجى تەهاى دۆغرەمەچييە، كانى شاعيرەكىَ چاڤ نەترس و ئازا بوو، بابىَ وى زانايەكىَ ئايينى يىَ گەورە و ناڤدار بوو، ب رەگەز دچنە سەر بەگزادەييێن هوَزا جاف، هۆزانڤان ل سالا (١٨٩٧)ز ل شارىَ ديّرينىَ هەوليّرىَ ژ دايك بوويە، ل سالا (١٩٥٧)ز چوويە بەر دلوڤانييا خودىَ مەزن.

(كانى) هيّشتا يىَ بچووك بوو دەمىَ بابىَ وى مرى، ژبەر هندىَ د وى تەمەنيدا ل هيچ خويّندنگەهەكىَ نەخوانديية، ل دەمىَ مەزن دبيت هەول و هاندانا مەلا توفيقىَ برايىَ وى حاجى مەلا ئيبراهيمىَ مامىَ وى، ل مزگەفتا (قەلات)يّدا ب ماوەيەكىَ كيّم فيّرى خاندنىَ دبيت و چەند پەرتووكيّن ئايينى دخوينيت لگەل هندەك پەرتووكيّن فەلەك و زانستى، هەر ب ريّكا زۆر خواندنىَ وهيكرنىَ شارەزايىَ ل ئەدەبييات و زمانىَ كوردى و فارسى و توركى پەيدا دكەت، پەيوەندييَ لگەل چەند ناڤداريّن وى سەردەمى گريّددەت وكى (حوسيّن حوزنى موكريانى) و (گيّوى موكريانى) و(ميهرى) و (مەلاى گەورەى كۆيى) و (بيّخود) و (دلدار)...

.كانى ل دەسپيّكا نڤيسينا شيعرىَ زمانىَ وى يىَ ئەدەبى پيّكهاتيبوو ژ كورديييەكا شيّوەى هەوليّرىَ يا تيّكەلكرى ب پەيڤيّن فارسى و توركى، چونكى ل كەلا هەوليّرىَ پەروەردە بوويە پشتى هنگى ب ريّكا خواندنا پەرتووكيّن هەمە جۆر و رۆژنامە و گوڤاريّن كوردى، هەروەسا دامەزراندنا وى ب فەرمانبەر ل بازيّركيّن رەواندوز كۆيىَ و شەقلاوە زمانىَ وى يىَ ئەدەبى ريّكتر و بهيّزتر بوويە، كو هەكە هۆزانيّن وى بەرامبەر ب

هـــۆزانـــێن هۆزانڤانـەکی سـلێمانییێ یـان کـەرکووکیێ وموکریـانیێ رابگـرین هەســتیێ ب جیاوازییــەکا وەسـا یـا زمـانیێ وی یــێ ئــەدەبی ناکــەین، کاریگـەرییا هۆزانڤانێن کلاسیزمی وەکـی (نالّی و سالم و کـوردی و شێخ رەزای تالّـەبانی و وەفـایی) لسـەر کـانی هەیـە، هەروەسـا هۆزانڤـانیێ تـورك (فـزوّلی) ب تایبــەتی دەمــێ داســتانا (لــەیلا و مــەجنون) یــا فــزوّلی ب دەسـتکارییەکا کـێم هاتییـە وەرگێـڕان بـۆ سـەر زمـانیێ کـوردی، دئـەدەبا (فارسی) ژی دا حەز ژشیعرێن (سەعدی) و (حافز شیـرازی) دکـر.

کانی هەر چەند ل دەرگـەهێ هـەمی هونـەر و بابـەتێن شیعری دایـە، وەکـی هەمی شاعیـرێن کلاسیزمی، ژهەر بابەتەکی چەند هۆزانـەك پێشکەشی مـە کرینـە ژ ستایش وپێ گوتن ودلداری و خوشەویستی ونیشتمانپەروەری و شـانازی ب خـۆکرن دگـەل بابـەتێن شیعری ڤەهاندینـە، بـەلێ تنـێ دشـیعرا (مـەی) و (دلـداری)دا سـەرکەفتییە نـاڤێ خـۆ هەبوویـە، چـونکە کـانی شاعیرەکێ مەی ڤەخۆریێ عاشق بوو، ژبەر هندی داهێنانەکا باش ل ئەڤان دوو مەبەستان ب دەست ئینایە، دڤێ مەیدانێدا شانازییێ ب خـۆ دکـەت و دبێژیت:

١- سەر فروّ ناکەم بۆ عـالەم چونکە عـالـی هیمەتم
نــاچــوێنم بۆ هــەموو دنیا لـەدەستم ڕەغبەتم

٢- زاهیـرم هەر مەردی مەیدانم وەکـو شێـری دلێر
گوێت لە بەیتم بێ دەکا ئیسباتی نوتق وقوەتم

٣- عــەســـرم ئــەبیم حـــورو سـەربـەست و فەهیم
بێ موحابا شاعیـرم مەشهـورە ( کانی ) شوهرەتم

٤- نـــامــەردم ئــەگـــەر مـیــنەتـی نامەردی بکێشم
پێم خوشتـرە ئەی ( کانی ) بەپشتا بەردی بکــێشم

(ژ دەسپێکێ سێ دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

ئەڤا ل خواریٚ ژی دقە شیعرەکا نیشتمانییا (کانی)یە کو شاعیر نیشتمانپەروەییٚ نیشاددەت بەلێ ب شێوەیەکی گەلەك سادە و ساکار و ئاشکرا.

(( خزمینە وەرن ))

١- خـزمیـنـە وەرن بــەقـوربـانی وەتــەن بـیـن
قـوربـانی چـیـا و دەشـت و بیابـانی وەتەن بین
٢- تـاکـەی لـەکـون و قـوژبنی ویـرانـە بـمیـنـین
بـا ئیـدی لـەسـەر کـۆششی عمرانی وەتەن بین
٣- تـاکـەی بگـریـن ئـێمە وەکـو هـەوری بـەهـاری
وەك رەعـدی سـەما دایما تـالآنـی وەتـەن بـین
٤- بـۆچ پێنەکەنین لـەم چـەمەنستانە وەکـو گـوڵ
بۆچ غونچە سیفەت سەر بەرگرییانی وەتەن بین
٥- بۆ گـەردەن وسینەو کەمەری دوژمنی بەد خـوو
یا دەست بەقەممەو خەنجەری بڕانی وەتەن بین
٦- یارەب چ دەبیٚ ئێمەش ئەگەر هەروەکو بەعزیٚ
لـەشکرشکـەن و ڕۆستەمی مەیدانی وەتەن بین
٧- تاکەی ئەدویێ (کانی) لە ئەوسافی خەت و خاڵ
واچـاکە لـەمەولا کە غەزەلـخـوانی وەتـەن بین.

(ژ دەسپێکیٚ چوار دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

# مەلا تەهـــــایێ مایی

ناڤێ وی (تەها)یە کوڕێ (شێخ مەزهەر)یە کورێ (شێخ تەها)یێ مایيە، ل شواتا ١٩٢٤ ل گوندێ مایێ هاتییە سەردنێ، ژ بنەماڵەکا دیندار و ڕوٚشنبیر و کورد پەروەرە، ئەڤ بنەماڵە د ڕەگەزدا ژمیـرە بەگێن (ئەلکێ)[١] نە، باپیرێ وی ژ شێخێن تەریقەتا نەقشەبەندی بوو. هەر ل سالا ١٩٢٤ گوندێ مایێ[٢] ژ لایێ هێزێن ئینگلیزی ڤە دهێتە سوٚتن، بنەمالا وی مشەختی قەزا (چەلێ) ل کوردستانا باکوور دبیت و بوٚ دەمێ سێ سالاٚن ل وێرێ ئاکنجی دبن – هەردوڕوودانا سوٚتنا گوندیدا پەرتووکخانا مەزنا (شیخ تەها)ی دهێتە سوٚتن – پاشان ڤەدگەرنە گوندێ مایێ و دەست ب خواندنا سەرەتایی دکەت لێ نەشیا ڕێزا شەشێ ب داوی بینت چونکە ل دەستپێکا سالا ١٩٤٠ ڕەوشا سیاسی و ڕوٚشنبیـری کارکرە سەر هەست و هزرو بیـرێن وی و کارتێکرن کرە سەر مەلا ئەنوەر مایی، ژێرە بوو هاندەر لەوڕا دەست ب ڤەهاندنا هوٚزانان کر و چوو ناڤ ڕێزین کوٚمەلاٚ (هیوا) و دەست بکارێ سیاسی کر پاشان چوو ناڤ ڕێزێن (پارتی دیموکراتی کوردستان) دا زوٚر حەز ژ خواندێ دکر، نێزێکی (١٥٠٠) پەرتووکان د پەرتووکخانا ویدا هەبوون لەوڕا زانین و ڕوٚشنبیـرییەکا باش پەیدا کردبوو تێکەلییەکا باش دگەل زانا و ڕوٚشنبیـرو ئەدیبان هەبوو، ل سالا ١٩٤٣ پەیوەندی ب بنەمالا بەدرخانیان کریە، (جەلادەت بەدرخان)ی ل شامێ هەردوو گوٚڤارێن (ڕووناهی) و (هـاوار) دەرئێخسـتن، هەموو ژمـارێن وان ب ڕێ یا پوٚستەی

---

(١) (ئەلکێ) گوندەکە ل باکوورێ کوردستانێ، نهو دبێژنێ (بێ شەباب).

(٢) (مایێ) گوندەکە ل دەڤەرا بەرواری بالاٚ سەرب پارێزگەها دهوٚکێ ڤە.

دگەهشتنە مەلا تەهای ل گوندێ مایێ، (دکتۆر کامیران بەدرخان)ی ل بەیروتێ هەردوو گۆڤارێن (ستێر) و (ڕۆژانوو) دەرئێخستن دیسان ب پۆستەی دگەهشتنە مەلا تەهای، هەڤالینیەکا مەزن دگەل هەلبەستەڤانێ ناڤدارێ کورد ئەحمەدێ نالبەند (موخلص) هەبوویە.

هەلبەستێن ڕەوان و نازك و فرە بابەت ڤەهاندینە، ئارمانجا وی یا سەرەکی ئازادی و زانین و زانست و ڕۆشنبیری بوویە، ڕێڤێنگێ ڕێبازا کوردینیێ بوویە لەورا هەردەم ئارمانجا ڕژێمین دژی کوردستانێ بوویە لەوڕا گەلەك دەربەدەری و هەژاری و نەخۆشی دیتینە، سروشتێ کوردستانێ زۆرکارکرە سەرو د هەڵبەستێن ویدا رەنگ ڤەدایە.

ل سالا ١٩٧٣ دبیتە ئەندامێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد / تایێ دهۆکێ.

ل سالا ١٩٧٩ بەشدارییێ دڤیستەڤالا سێیێ یا هەڵبەستا کوردیدا دکەت ل سولێمانییێ.

ل سالا ١٩٨٧ بەرەف ئێرانێ دچیت و دبیتە پەنابەر هەتا سەر هەڵدانا پیرۆزا ١٩٩١ یێ جارەکادن ڤەدگەریتە کوردستانێ ول بازێرێ دهۆکێ ئاکنجی دبیت.

ل سالا ١٩٩٥ دبیتە خودانێ ئیمتیاز گۆڤارا (پەیڤ).

ل سالا ١٩٩٨ دیوانا خۆیا هەڵبەستێ بناڤێ (دل دەرێژکرن) چاپ کر، پێش وەغەرا دووماهێی بکەت فەرهەنگاوی یا (کوردی – کوردی) تمام بوو لێ نەگەهشت ل چاپ بکەت.

ل ٢٥ / ١١ / ٢٠٠٠ دژیێ (٧٦) سالییێدا ل بازێرێ دهۆکێ دچیتە بەر دلوڤانیا خودێ.

مەلا تەهای ب بیرەوەرییا شەهیدێن دیار بەکرێ و نسکۆیا شۆڕەشا شێخ سەعیدێ پیران و سێدارەدانا پیران زۆر داخبار بوویە و ئەڤ هەلبەستە ڤەهاندی یە.

## ( شینی و تازیا شەهیدا )

١- شینی و تازیا شەهیدا ئەم ژبیر ناکەین چوجار
دێ ڤەکەین تۆلا نەهەنگا وەختەکێ زێڕین بژار

٢- وان مەغولا ڕاڤ دبەستن شێرو مێر سەر دهنجنین
توخم و نقشێ وان قەلاندن هەمی گاڤا دپەچنین

٣- تورکا گرتن شێرو مێر چاك دەست و پێ لێ قەید کرن
کەت بکەت گرتن و کوشتن لبن سێپێکا خڕکرن

٤- ڕستکا شەنقێ بو دانا خەندقاند پاریز وەلات
شێخ سەعیدێ جان فیدا ڕەشە ڕۆژەك بۆمەهات

٥- ئەو ڕوبادێ قەبقەبی چو ئاخ و زاری بوون بلند
چوو دلێ شێری ژ ناڤ مەبێ خودان مان دەشت و گوند

٦- بو قێری زێمار و شینی کو وەلات مابێ خودان
پۆسیدە دلسۆژو خەمگیر هەر هەوارێ دکەن ئەمان

٧- نی ژ خـەمـاوە ئـەم بـهوژتین ئـەی شـەهیدێن ڕەحمەتی
دێ ئـازاکـەین نـاڤ و دەنگا کـوردەوارێـن بـەرکـەتـی

٨- بـا دکـەت وە گـەلـی کـوردا شێخ سـەعـیـدێ پـڕ هـۆنەر
یـەك بـین بـۆ ڤـێ وەلاتـی دا ژ ژانـێ بـێـتـە دەر

٩- ژانـەکـە قـەویـا گرانـە ئێـشـەکـە بـۆکـەڤـنـەریش
بـرسـی و رویـسـی هـەر نیـشـانـە بـۆمە ئـەم بێ کـاروئیش

## ڕاڤەکرنـا پـەیـڤـان:

| | |
|---|---|
| ل شواتا | : ل هەیڤا شوباتێ. |
| سەردنێ | : سەر دونیایێ. |
| بەدوای بینیت | : تمام بکەت. |
| ژێرە بۆ هاندەر | : بۆ وی بۆ هاندەر. |
| لـەوڕا | : ژبەر هندێ. |
| سێپێکا | : سێدارە ، قەنارە. |
| رووبادێ | : کەوێ رووباد. |
| غەمگیـر | : غەمگین. |
| ڕاڤ دبەستن | : راڤ بۆ د دانان ، بویسەبۆ ددانان. |
| کەت بەکەت | : یەك بەیەك. |

| | |
|---|---|
| سیپێکـا | : سیپایە، سێدارە، قەنارە. |
| ڕستەکا شەنقی | : وەریسێ سێدارەدانێ. |
| ڕووبادێ | : کەوی ڕووباد. |
| ئاخ زاری | : ئاخ و ناڵە. |
| چوو دلێ شێری ژناڤ مە | :مە دلێ شێری نـەما. |
| بۆقێری | : بووە هاوار و قیـرە. |
| توخم و نڤشی | : توخم و ڕەگەز |

## كـــامـــەران مـــوكـــری

## ١٩٢٩ - ١٩٨٦

نـاڤێ وی (محەمـەد ئەحمـەد تـەها)یـە، ل سـالا (١٩٢٩) یێ زاییـنـی ل بـاژێرێ سـلێمانییێ ژ دایـك بوویـە، خوێنـدناوی هـەتا پـۆلا دیمـاهیێ یـا ئامادەیی بوو، لێ ژبەر چەند ئەگەران تمام نەکرییە. دناڤبـەرا سالێن ١٩٤٩ – ١٩٦٣ بۆ ماوێ شەش سالان ژ ئەگەرێ هەلویستێ وی یێ نیشتمانی و نەتەوایەتی مایە دزیندانانڤە.

ماوەیەکێ درێژ ل پشکا زمانێ کوردی ل زانکۆیا سلێمانی و پاش ل زانکۆیا سەلاحەدین مامۆستاییێ ئەدەبیاتێن کوردی بوویە،تا ٧ / ١٢ / ١٩٨٦ ل باژێرێ هەڤلێرێ وەغەرکرییە.

حەفت دیوانێن شیعری چاپکرینە دناڤبـەرا سالێن (١٩٥٤ – ١٩٧١) و ژدیارترین دیوانان (ئاشتی) و (دیاری) و (ئاگرو ژیلـە) و (گولاڵـە سووره). و پشـتی مرنـاوی ل سـالا ١٩٨٧ هـەمی هـۆزانێن وی ب نـاڤێ دیوانـا (کامـەران مـوکری) هاتییـە چاپکرن. هەلبـەت ژبلـی هۆزانڤـانییێ کامـەران موکری چیرۆك نڤێس ژی بوو.

**مەبەستێن هۆزانێن کامەرانی:**

ئەگەر هـۆزانێن کامـەران مـوکری بخـوینین دێ بینین چـەند مەبەستـەك تێدا هەنە، وگرنگترین مەبەست ژی ئەڤەنە:-

١- نەتەوایـەتی و مرۆڤایـەتی : بەشـەکێ زۆرێ هـۆزانێن مـوکری هۆزانـا نەتەوایەتییـە: دیـارە هۆزانڤـانی ب وێ هەسـتێ ناسـکێ هـەی وەك کەســەکێ نەتــەوەخواز هەلویســت بەرامبــەر چەوســاندنا نەتــەوێ خــۆدا وەردگریــت. و کۆمەلــەکا هــۆزانێن هــەین کــو دبنــە نمــونێن

هەستێ بەرزێ نەتەوایەتی و بۆ مە دیاردبیت کو موکری شاگردو قوتابیێ قوتابخانەیا پیرۆزا کوردایەتێیە و وەك شاعیرەکێ ریالزمیێ شورەشگێرانەیێ نەتەوەیی خۆ نیشاددەت و ژیان ژی ل نك وی هەر تێکۆشان و خەباتە درێیا کوردستانێدا.

١- ژین لەلای دڵسۆز هەر تێکۆشانە

هەولە بۆ خاکی ئەم کوردستانە

٢- خۆزگە ئەندازەی ژیان و تەمەن

تێکوشان بوایە بۆخلکی وەتەن

٣- ئاخۆ تەمەنی کام دڵسۆزی کورد

لە چوار پێنج ساڵێ، تێپەڕی ئەکرد؟!

(هەمی بۆ ژبەرکرنێ یە)

دتەوەرەکێ دی ژیدا سەرەڕایی هندێ کو کامەرانێ شاعر دلسۆزێ نەتەوێ کوردە هزر بیرێن خۆ یێن مرۆڤایەتی دەردبڕیت، ل دەمێ خەباتا گەلێ جەزائیرێ دژی داگیرکەرێ فەرەنسی ب خەباتەکا رەوا ددانیت و دەنگێ شۆڕەشگێرێ مللەتی کورد و مرۆڤی کورد ددەتە پالێ خەباتا وی گەلی. دپارچە هۆزانا (ئەی جەمیلە) وی هەستێ پیرۆز دەردبڕیت.

١- ئەی جەمیلە .........

سلاو لە ئاگرو ژیلە

٢- لە حەیرانا ، لە لاوکا

کاتێ کچ لەگەڵ ، باوکا

٣- هەڵمەت ئەبەن بەرەو مردن

بەرەو قەڵای سەختی دوژمن

٤- لـــه هـێـرشـی سـەركــەوتـنـا
لـــە كـاتی بــۆگــەل ، مـردنا
٥- كـاتــیٚ لــەنزار ، لــەمــەڵـبـەن
ئــەمــانـسـووتـێـنن بــۆوەتــەن
٦- نــاوت وەكــو وشــەی نـــەمــر
ئــەرژێــتــە نــاو گــەرووی ئـاگر
٧- ئـــــەی جـەمـیــلــە .........
ســلاو لـــــە ئـــاگـــرو ژیــلــە

(هەمی بۆ ژبەركرنێ یە)

٢- **خۆشەویستی و ئەڤینی**: مەبەستەكێ دی یێ شعرێن كامەرانی دلداری و ئەڤینییــە، دیــارە ئــەڤ هەســتە ژی هەستەكێ مرۆڤایەتییــەژ دەروونەكێ پڕ سۆز و ناسك سەرهلددەت، دبێژیت:

١- كـە پــرچــت ئــالاٚن لــە گـــەردن
گــرت بــەردا لـــــە دڵــی مــن
٢- كـە پـەلاچــەمت ڕشـتـە سـەر ڕوو
ئـــاگـــر لـــە دەرونـم بــەربــوو
٣- ئـــەی زۆرداری جـــوانــی بـچــووك
تـكـایـە كــچـی ئــێــســك ســووك
٤- لـێـرەوە مــەیــە شــەیــدا مــۆت
وەبــاڵــی دڵــم بــە ئـەســتــۆت

(هەمی بۆ ژبەركرنێ یە)

٣- **وەسفکرن**: ئەڤ مەبەستە ژی ئێك ژ مەبەستێن گرنگێن شعرا موكرییە، كامەرانی هەستەكێ بهێز بەرامبەری جوانیا سروشتی و دەوروبەران هەبوویە، ئێكە ژ وان شاعران كو جوانیا سروشتێ وەلاتێ خۆ پەرستن، و ژڤی لای ڤە پتر بەرەڤ شاعرێن كلاسیكی ڤە دچیت، گەلەك جاران جوانیا سروشتێ تیكەل كرییە ب جوانیا ئافرەت وب جوانیا كچا كورد، وتابلویەكێ هەرە جوان ب واتایا پەیڤان بكارئینایە، وهەستێ ناسكێ شاعری دیمەنێ جوان دروست كرییە، تەماشە بكە چەوا وەسفا (گوند)ی دكەت:

١- كەژو دارستانی كپی
پۆشیویانە بەرگی سپی
٢- قوببەی پیرۆزەیی ئاسمان
بە پرشنگی گزنگی ئال
٣- داوێنی كەژی ئەنەخشان
وەك ئەگریجە ئەبوو پەخشان
٤- دێیەك، لەباوەشی كەژا
بزەی گەرمی لێ ئەرژا

(هەمی بۆ ژبەركرنێ یە)

## ڕۆخسارا هۆزانێن وی:

١- بکارئینانا کێشا خۆمالی (پەنجە): کامەران ئێك ژوان هۆزانڤانایە کو بەرگەکێ نوی کریە بەر هۆزانا کوردی، وپەنا بریە کێشا ڕەسەنا خۆمالی، وخۆ ڕزگارکر ژ دیڤەلانکیا عەروزا عەرەبی، ژبەرهندێ هۆزانێن وی ڕێتمەکا کوردی تێدا دیارە کو دگەل هەست و ئارەزوویا مرۆڤێ کورد دگونجیت. نموونەیێن هۆزانێن وی کو مە بەری نهۆ نڤیسین ڤێ ڕاستیێ بۆ مە دیاردکەن.

٢- کێم بکارئینانا پەیڤێن بیانی: ژ ئەڤی لایەنی ژی ڤە کامەرانێ شاعر ب رابەر دهێتە دانان، هندی دشیاندایە خۆ ژ پەیڤێن بیانی دوور ئێخستیە. ل جهێ وان پەیڤێن کوردی یێن ڕەسەن بکارئینایە، وەکو مەلەڤانەکێ شارەزا ددەریایا زمانێ کوردیدا مەلەڤانی کرینە.

٣- خۆنەگرێدان ب سەروایا یەکگرتیڤە، وبکارئینانا جووت سەروا: ئەڤ لایەنە ژی ئێکە ژ سیمایێن جۆداکەر ژ شعرا کامەرانی، ولایەنەکێ دی یێ تازە نیشا ددەت، و چ دەما کامەران نەبوویە دیلێ سەروایا یەکگرتی، بۆ نموونە ئەڤێ پارچە هۆزانێ دا هەردوو نیڤا دێران ئێك سەروا هەیە، واتە جووت سەروا بکارئینایە.

١- ڕوومەتی وەك گوڵی بێگەرد
ڤژی خاو، ئاوریشمی زەرد
٢- چاو کاڵ، ئەگەر چی نەرمە
بەلام نیگای ئێجگار گەرمە

٣- بــالاّی وا، دەمــێکــی واتـــەنــگ
ئــەندامی ئـــاوا شـــۆخ و شــەنگ
٤- نــەبووە، یــامــن نــەم دیــوە هــەر
لــەو چــەشــنــە بــەژن، یــاکــەمەر

(هەمی بۆ ژبەرکرنێ یە)

## ڕاڤەکرنــا پــەیــڤــان:

| | |
|---|---|
| ئەندازە | : پیڤان ، پێوانە. |
| تێپەڕی ئەکرد | : زێدەدبوو ، ژێ دەرباز بوو. |
| هەڵمەت ئەبەن | : هـێـرش دکـەن. |
| بۆ گەل مـردنـا | : مـرن ژ پێخەمەت مللەتیدا. |
| ئەمانسووتێنن | : مەدسوژن ، ئاگری بەردەنەمە. |
| ئـالان | : تـێ ئـالاَندن. |
| رشتە سەر ڕوو | : بەردایە سەر دێم و چاڤان. |
| ئیسك سووك | : هەستی سڤك. |
| وەبـال | : گـونـــەه. |
| ئـەسـتـۆ: | : مــل ، سـتـوی. |
| بێگەرد: | : پــاك ، خــاوێن ، پاقژ. |
| قژی خـاو: | : پــرچ ڤەکری. |
| ئاوریشم: | : ئـارمیش. |
| نـیـگـای: | : سـەحـکـرن ، تـەمـاشـەکـرن. |

## مەلا مەحموودێ بایەزیدی

ل سالا ١٧٩٩ ل بـاژێرێ بایەزیـدێ ژ دایـك بوویـە، ڕەوشـا سیاسـییا بایەزیدێ ل نیڤا ئێکـێ ژ سـەدی نـۆزدی یاباش نـەبوو ژبـەر جهـێ وێ کو دکەڤیتە نێزیکی توخیبێ (روسی – ئوسمانی) هەڤڕکییا دناڤبەرا هـەردوو ئالیاندا کارتێکرنەکا نەرێنێ ل سەر ژیانا بایەزیدی یا جڤاکی و ئـابووری هـەبوو. مـەلا مـەحموودێ بایەزیـدی ل زارۆکینیا خـۆ چـوو ڕێـزێن قوتـابیێن مزگەفتا و زانستێن ئیسلامی، ل بایەزیدێ خواندن و باوەرناما مەلایـەتیێ وەرگرت. پاشی سەرا وەلاتێ ئیرانێ دا ول باژێرێ تەبرێزێ ئاکنجی بوو، ل وێرێ خواند هـەتا فێـری فارسیێ بووی وشارەزاییەکا باش دزانستێن ئـەدەبی و دیرۆکـی و فەلسـەفی و مەنتقیدا پەیـداکر، جارەکا دی ڤەگـەریا باژێرێ بایەزیدێ، پاشی بەرەف ئەرزە رۆمێ چوو ول وێرێ ئـاکنجی بوو، بـەلێ دیارنەبوویـە کـا هـەتا مرنـێ ل وێـرێ مـابوو یـان بـەرف جهـەکێ دی چـوویە، هەڤالینیـەکا بـاش دناڤبـەرا وی و قونسـلێ روسـی (ئەلکسـاندەر ژاپا)یدا پەیدابوو کو کوردی باش دزانی، (ژاپا)ی زۆر مفا ژ هەڤالینیا خـۆ دگەل بایەزیدی وەرگرتییە و بایەزیدی زۆر هاریکاریا وی کریـە کـو چـەند دەسـتنڤیەکا ب دەسـت خـۆڤـە بینیـت و گەلـەك جـاران هەکـە نەشـیابا دەستنڤیسـی بـو پـەیدا بکـەن دا بـو وی فۆتۆکـوپی کـەت. (ژاپـا)ی گەلـەگ جاران دگوت: مللەتێ کورد قـەرداری مـەلا مـەحموودێ بایەزیدییـە، چـنکو گەلەك لایەنێن ڕەوشەنبیری پاراستینە.

**ڕەوشەنـبیـریـا بـایـەزیـدی:**

مـەلا مـەحموودێ بایەزیـدی شـارەزاییەکا بـاش دزانسـتێن شـەریعەتێدا هـەبوو، چـەندین کەسـان لبـەر دەسـتێ وی خواندییـە. زمـانێن: کـوردی،

فارسی، عەرەبی، تورکی باشی دزانی و وان زمانا کارتێکرن ل سەر بەرفرەهبوونا رەوشەنبیری و رووناکبیریا وی هەبوو، ژبەر کو ئەدەبێ وان مللەتان دخواند و مفا ژێ وەردگرت، شارەزایی د دیروکێدا هەبوو، وەرگێرەکێ خودان شیان بوو، چەندین بەرهەمێن فارسی و تورکی وەرگێراینە سەر زمانێ کوردی. هندەك جاران ناسناڤێ (فەقێ مەحموود ئەفەندی) یان (خواجە مەحموود بایەزیدی) ب کاردئینا، بەلێ دناڤ کورداندا ب ناسناڤێ مەلا مەحموود بایەزیدی ناڤدارە.

## بەرهەمێن بایەزیدی:

١- کتاب عادات و تقالیدی ئەکراد: لدور رەوشت و تیتالێن کوردایە وەك شەهیانێن وان، ئاشتی و شەرێن وان، دەسپێك ژی لدور بنیاتێ کوردان و زمان و وەلاتێ وانە.

م. رۆدینکۆ وەرگێرایە سەر زمانێ رووسی ول سالا (١٩٦٣)ێ ل مۆسکۆ بەلاڤەکریە.

دکتۆرە شوکریە رەسول وەرگێرایە سەر دیالێکتا (کرمانجیا خارێ) ول سالا (١٩٨٢)ێ ل بەغدا چاپکریە.

٢- تحفە الخلان فی لسان الکرد: لدۆر رێزمانا زمانێ کوردیە، هەتا نهو ژی دەستنڤیسە ل پەرتووکخانا (سالیکۆف شیدرن) ل (پترسپورك ل رووسیا) هاتیە پاراستن.

٣- وەرگێرانا پشکا ئێکێ ژ پەرتووکا (شەرەفنامە) ژ فارسی بۆ کوردی ل سالا (١٨٥٨)ێ ز. وەرگێرایە.

٤- تاریخا نوو یا کوردستانێ (١٨٥٧)ز.

٥- رسالة في بعض الفروق الموجودة بين اللهجات الكردية وبيان بعض القواعد اللازمة، ئانكو: نامەیەك دەربارەی هندەك جیاوازییێن هەین دناڤبەرا دیالێکتێن کوردی و دیارکرنا هندەك بنواشێن پێدڤی، (پەرتووکا سالیکۆف) شیدرن ل پترسبورگ).

٦- قاموسەکا بەراودکرنێ دناڤبەینا زارێن هەکاری و ڕەوەندی دگەل زمانێ فرەنسی دگەل (ژاپا)ی.

دکتۆر مارف دپەرتووکا خۆ یا نافبریدا بەلاڤەکریە.

٧- چیرۆکا مەم و زینێ ب دیالێکتا کرمانجیا ژۆری ل (١٨٥٦)ز. (ژاپا)ی ئێخستە سەر ئەلف و بێیا لاتینی و وەرگێرایە سەر زمانێ فرەنسی.

٨- چیرۆکا (لەیل و مەجنون) ل سالا (١٨٥٨)ز نڤیسییە و ژلایێ (ژاپا)ی ڤە ئێخستیە سەر ئەلف و بێیا لاتینی و وەرگێرایە سەر زمانێ فرەنسی.

٩- جامع یێ رسالیان و حکایەتا، چل چیرۆکێن کوردیە، کو دبیتە ئێکەمین کۆمەلا چیرۆکان د دیروکا ئەدەبیاتێ کوردی و (ژاپا)ی کریە فرەنسی.

هەروەسا چەندین چیرۆکێن دی نڤیسینە وەك (یوسف و زولەیخا) و داستانا (قەلای دمدم) و گەلەگ بەرهەمێن دی کو هژمارا وان دگەهتە بیست و شەش بەرهەمان.

تێبینی: هەتا نوکە دیارنەبوویە کا مەلا مەحموودێ بایەزیدا د چ سالدا چوویە بەر دلوڤانیا خودێ، هندەك دبێژن ل سالا (١٨٦٠) و هندەك پەرتووك ژی دبێژن ل سالا (١٨٦٧).

# پـارچـەك ژ چیـروٚکـا مـەم و زیـنـیٚ

میـر زەینـەدین نێزیکـی ئیڤـاریٚ ژ نێچیـریٚ زڤڕی، وەها ڕاست هاتە باغیٚ، ل بەر دەریٚ ویٚ قەسرا مەعلووم ژ هەسپی پەیابوو، ل ڤڕ شەربەت و قاوەیـەکیٚ بخوٚن و دگـەل غـولام و ئولداشێد خـوە، وەها ژ نشـکێڤە هاتنە دەریٚ قەسریٚ کو مەم و زین تێدا بوون، زین ویٚ وەختی کو دەنگیٚ برایـیٚ خوە بیهیست هوٚش هاتە سەری و گوت مەموٚ چە دبێژی و چە دکەی؟ ئەڤە میر هات؟ کوٚ ئەڤ خەبەرا گوٚت، ئێدی ناچاری، مەم و زین ئەستاندە بنیٚ عەبا خوٚە و ڤەشارت ول گوٚشەیەکی قەسریٚ قەلبەخی و روینشت دنێڤ دوو بالگیانـدا وەها ب ویٚ حالیٚ، میـر دگـەل قـەرەبالغا خـوە هاتـە هندڕی قەسریٚ و دیت کوٚ مەم خوە ل عەبایێ پێچـایە ل گوٚشـەیەکی ڕونشتییە. میـر سلاڤ دا ژی، مەم سلاڤ ئەستاند، ئەمما قەت ژ جهیٚ خوە نەبزافت. میـرم معزور بدیرین ئەز بەنی نوخوٚشم هاتمە ڤڕاو من تاگرت قەت مەجالا لیات و حەرەکەتی نادیرم ل ڤرا وەها مام. میـر گوت: کو زەرەر نینە ل کەیفا خوە نێرن. میـر روینشت و هەر کەسەك جیٚ بەجیٚ روینشتن، دیوانخانە تژی بوو، میـر شەربەت و قەهوە ئەمرکر، ئیشەڤ ل ڤڕا کەیفیٚ بکن.

ژ هەر تەرەفەکی دەست ب کەلام و خەبەردانیٚ کرن، مەجلیس کەملی و گەرم بوو. تاجدین دویٚ مەجلیسێدا حازر بوو، ل حالیٚ مەموٚ نێری. زانی کوٚ ژ ئەحوالەکی عەجیبە. خالی نینە کو مەم وەها نوقمیٚ بەحرا غەمان بوویە، تاجدین رابوو هاتە نێزیکی مەموٚ وب ئیشارەت ئەحوالیٚ وی ژیٚ

پرسیار کر، مەم ژی دوو کەزی ژ پۆرێد زینێ ژ هۆچکا عەبایی ب خف دەرئانی و نیشانی تاجدینیدا.

(ژ دەسپێکێ ژ (میرزێنەدین نێزیکی ئیڤارێ) بو ژبەرکرنێیە هەتا (ئەمما قەت ژ جهێ خوە نەبزافت)).

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| خەف: | نهێنی = ب دزیڤە. |
| لپات: | لڤین. |
| هێسای: | ڕاحەت : حەسانەوە ، بێهن ڤەدان. |
| پەیا بوو: | دابەزی. |
| لەڤر: | ل ڤێرە. |
| ئەستاندە: | ستاندییە. |
| هندر: | دناڤدا ، ژوورڤە. |
| سلاڤ ئەستاند: | سلاڤ وەرگرت. |
| نەبزاڤت: | نەلڤی. |
| نێڕی: | سەحکری ، تەماشەکر. |
| خاڵی نی نە: | ڤالانینە. |
| پۆر: | پرچ. |
| بالگی: | بالیفك. |
| ڕەوشا سیاسی: | باری سیاسی. |

هەردوو ئالییان دا: هەردوو لایاندا.

جڤاکی: کۆمەڵایەتی.

مـفـا: سوود ، قازانج.

ل هەسپی پەیابوو: ژ هەسپی هاتەخار.

ئوڵداشێدخوە: هەڤالێن خۆ.

هۆش هاتە سەری: هاتە سەر هشێن خۆ.

هاتە هندرێ قەسرێ: ناڤ قەسرێ.

قەلبەخی: سەکنی ، وتبوو.

تژی بوو: پڕبوو.

ئیشەڤ: ئەڤ شەڤە.

